






# فەرهەنگی دەرمان

کۆکردنەوە و نووسینی: د.ئەحمەد گوڵ

پێداچوونەوەی: د.ئەحمەد بەدرخان



**ناوەندی ڕەها**

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەری گشتی ناوەند: **زامدار قادری**

بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: **ئەیاد نادر**

بەڕێوەبەری هونەری ناوەند: **محمد جبار**




**هەولێر، بازاڕی ڕۆشنبیری، تەنیشت پارێزگا**

**+964 750 406 6674**

 **Raha / ڕەها**



ژمارەی بڵاوکراوە: ٣٦

ناوی کتێب: **فەرهەنگی دەرمان**

ئامادەکردن و کۆکردنەوەی: **ئەحمەد گوڵ**

دیزاینی ناوەوە:**ئەیاد نادر**

دیزاینی بەرگ: **ئەحمەد عەبدالله هەرتەلی**

ساڵی چاپ: **٢٠٢٠**

تیراژ: **١٠٠٠ دانە**

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە سپاردنی ( **٢٥٨** ) ی ساڵی ٢٠٢٠ ی پێدراوە.

## بە ناوی خودای گەورە و میهرەبان

خوێنەری ئازیز منیش وەک هەر قووتابییەکی تر، کە بەشێکی پزیشکیم خوێندووە وانەکانم هەمووی بە زمانی ئینگلیزی بووە.

بەڵام هەمیشە ئارەزووم بووە کەوا کتێب و سەرچاوە پزیشکییەکان بە زمانی کوردی وەدەست بێنم، بۆیە زۆر و کەم بە هیوا بووم و هەوڵمداوە بتوانم شوێنپەنجەی خۆم جێبهێڵم و خزمەتێک بکەم.

ئەگەر بچووکیش بێت، چەند پەڕاوێکی سەرەتایش بێت شتێک بخەمە چینگی فێرخوازان و زانستدۆستان.

ئەم کتێبەی بەردەستیشت ڕەنگە کارێکی نایاب و بێ کەموکوڕی نەبێت، وەلێ هەوڵی خۆم داوە و بەشێک لە تەمەنی خۆم پێ بەخشیوە، بەهیوام لە داهاتوو هەموو بابەتە پزیشکییەکان بە زمانی کوردی بەردەستبن و جگە لە خوێندکارانی بەشە پزیشکییەکان، خەڵکی تر بتوانن بەهرەمەندبن و سوودی لێ وەرگرن. ببێتە سەرچاوەیەکی زانیاری باش بۆیان .

ئومێدەوارم خوێنەران چاوپۆشی بکەن لە کەموکوڕییەکان و لە داهاتوودا کەسانی پسپۆرتر لەو

بــواره كــاری زیــاتر بــكەن، ئەم كتێــبەی مــن ببێــتە سـەرچاوەیەک بـۆ وەگەڕخسـتنی نووسـەرانی بـابەتە پزیشکییەكان.

ئەحمەد گوڵ

٢٠٢٠/٢/٢١

## چۆنیەتی بەکارهێنانی دەرمان

دەرمانەکـان بە یەکێـک لەم شـێوازە بـاوانەی خـوارەوە بەکاردێن:

١. حەب و شرۆب لە ڕێگای دەمەوە.

٢ .دەرزی لەڕێگـای ماسـولکەوە یـان ژێـر پێسـت یـان دەماری خوێن.

٣ .مەرهەم و جێلْ و کرێم لوشن لە ڕێگای پێست.

٤ .پرژێن(سپرای) لە ڕێگای هەناسەوە یان پێست.

٥ .شاف لە ڕێگـای کۆم یان لە ڕێگـای زێ لە ئافرەتان بەکاردێت.

٦. دلۆپ لە ڕێگای چاو یان گوێ یان لووت بەکاردێن.

# گروپەکانی سکپڕی چین

## FDA Pregnancy Categories

لە ساڵی ٢٠١٥ ڕێخکراوی خۆراکی ئەمریکی هەستا بە نوێکردنەوەو پۆلێن کردنەوەی ئەو دەرمانانەی کە لەگەڵ سکپڕی دەگونجێن یان نا.

هەستا بە دیاری کردنی مەترسیکانی و زیانەکای و سودەکانی.

بۆ ئەم مەبەستە هەستا بە تاقیکردنەوەی لەسەر ئاژەڵ تایبەت ئەو ئاژەڵانەی کە پێکهاتەیان لە مرۆڤ نزیکە، کە بەم شێوەیە ناویان لێنراوە:

گروپیA

گروپیB

گروپیC

گروپیD

گروپیX

کە لە ساڵی ٢٠١٥ بەم شێوەیە نوێکراوەتەوە و داڕێژراوەتەوە.

## گروپی A

ئەم گروپە خواردنی پێویستە لە کاتی سکپڕی، بە باشی کۆنترۆڵ کراوە و لە دوای تاقی کردنەوەی چ لە سێ مانگی یەکەمی دووگیانی چ لە سێ مانگی کۆتای دووگیانی کە سەلمێنراوە زیانی نیە لەسەر دووگیان وەک نمونەی ئەم دەرمانە:

levothyroxine

folic acid

liothyronine

## گروپی B

ئەم گرووپە تاقی کراوەتەوە لەسەر ئاژەڵ زانراوە کە کاریگەری هەیە لەسەر سکپڕ بەڵام هیچ مەترسیەک نەبینراوە لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت وریابین.

وەک نمونەی ئەم دەرمانانە:

metformin

hydrochlorothiazide

cyclobenzaprine

amoxicillin

pantoprazole

## گروپیC

ئەم گرووپە زیانەکانی بینراوە لە ئاژەڵ لە ئەگەری لەناوبردنی کۆرپەلە، بەڵام بەشێوەیەکی ئاشکرا لەسەر مرۆڤ نەسەلمێنراوە، سەرەڕای ئەمەش سودەکانی وادەکات بەکاربهێنرێت سەرەڕای زیانە شاراوەکانی.

وەک نمونەی ئەم دەرمانانە:

tramadol

gabapentin

amlodipine

trazodone

## گروپیD

بەڵگەی ئاشکرا هەیە لەسەر زیانەکانی لەسەر کۆرپەلە و دایکی سکپڕ کە لەوانەیە ببێتە هۆی مردنی، بەڵام

سـوده شـاراوەکانی وادەکـات بەکاربهێنرێـت سـەرەڕای زیانەکانی.

وەک نمونەی ئەم دەرمانانە:

lisinopril

alprazolam

losartan

clonazepam

lorazepam

## گروپیX

دەرمانەکـانی ئەم گـرووپە بە مەترسـیدارترین دەرمـان دادەنـرێن لەسـەر ئـافرەتی دووگیـان کە سـەرەڕای سودەکانیشی نابێت بەهیچ شێوەیەک بەکاربهێنرێت.

وەک نمونەی ئەم دەرمانانە:

atorvastatin

simvastatin

warfarin



Amoxicillin

## ئەمۆکسی سیلین

**ناوەکانی ترک:**

Polymox ،Amoxil, Trimox , Imacillin

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت دژی بەکتریا و وردە زیندەوەرەکان هەروەها لەکاتی هەوکردنی گوێ، لووت، قورگ، لەوزەتێن، پێست، گوێی ناوەڕاست، ئەڵووەکان، میز و ڕێڕەوەکانی، گرانەتا، ددان، سییەکان.

هەروەها بەکاردێن بۆ لەناو بردنی بەکتریای (Helicobacter pylori)کەدەبێتە هۆی برینی گەدە و دوانزە گرێ.

**کاریگەری لاوەکی :** هەستیاری، هێڵنجدان و ڕشانەوە و تێکچونی گەدە .

**شێوەی دەرمان :** کەپسول - شروب - دەرزی.

# Co-amoxiclav

## کۆ ئەمۆکسی کلاڤ

## Amoxicillin/Clavulanic acid

**ناوەکانی تر** : Clavulin , amoxiclav , augmentin , amoclan

**بەکارهێنان:**

چارەسەری هەوکردنی بەشی خوارەوەی ڕێڕەوی هەناسە، هەوکردنی لووت و قورگ و سورێنچک و بۆری هەناسە و هەوکردنی سییەکان و هەوکردنی ئاڵووەکان, هەوکردنی دەم و ددان و کیسی ددان, هەوکردنی گوێی ناوەراست، چارەسەرکردنی هەوکردنی برین و زامداری، هەوکردنی کۆئەندامی میز و میزەرۆ وەکو بۆری میز و میزڵدان.

**کاریگەری لاوەکی :**

هەستیاری - هێڵنجدان - ڕشانەوە - سەرئێشە - سەرگێژبوون.

**شێوەی دەرمان** : حەب ، شروب ، دەرزی.

# Ampicillin

## ئەمپیسیلین

**ناوەکانی تر :**

Principen , Ampicin , Ampicinal

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە، لەوزەتین، قورگ، بەکاردێت بۆ هەوکردنی کۆئەندامی میز و میزەڕۆ، بۆ هەوکردنی کۆئەندامی هەرس، هەوکردنی لەش بەهۆی بەکتریا.

**کاریگەری لاوەکی:**

هەستیاری پێست، کاریگەری لەسەر کۆئەندامی هەرس دروست دەکات .

**شێوەی دەرمان:**

کەپسول ، دەرزی ، شرۆب.

# Aspirin

# ئەسپرین

Aspirin [Acetyl salicylic acid]

**ناوەکانی ترک :**

Aspirin , Entrophen , Astrin , Bamyl , Magnecyl , Trombyl , Dispirin , Empirin , Ecotrin

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بە مەبەستی چارەسەری سەرئێشە، تا، دان ئێشە، ئازاری ماسولکەکان، وە دەشتوانرێت بەکاربێت وەک ئازارشکێنێک لەکاتی ڕۆماتیزمەدا. هەروەها بەکاردێت بۆ خوێن ڕوونکردنەوە دژی خوێن مەین و تۆپەڵ بوونی خوێنە .

**کاریگەرک لاوەکی:**

تێکچوونی گەدە و ریخۆڵە - گرژبوونی بۆری هەوا - هەستیاری - هێڵنجدان .

**شێوەی دەرمان:**

حەب _ فوار.

**تێبینی:**

بـۆ ئـافرەتی دووگیـان ئەم دەرمـانە پـۆڵێن دەکـرێ بـۆ جۆری(C)،

نابێت بەکاربێت لە کاتی شیردان،

بەکارهێنانی ئەم دەرمانە دەبێتە هۆی زیادبوونی برینی گەدە و خوێن بەربوون،

ئەگەر برینی گەدە هەبوو پێویستە لەکاتی خواردن بەکار بێت،

وە دەبێـتە هـۆی زیـاد بـوونی نەخۆشـیەکانی ڕەبـۆ و هەناسەتەنگی.

# Amitriptyline

## ئەميتريپتيلين

### ناوەكانی ترک

Tryptizol, Saroten, Laroxyl

### بەكارهێنان:

يەكـــێكە لە دەرمـــانە دژە خەمۆكيەكـــان وە دژی ڕارايی(قەلەقـــی) و دڵەراوكێـــيە ، هەروەهـــا بەكاردەهێنرێـــت بـــۆ ئـــازاری كۆئەنـــدامی دەمـــار, چارەسەری ميز ڕانەگرتنی شەوانەی منداڵان .

### كاريگەری لاوەكی :

دڵەكـوتێ - گێـژی - خەواڵـوويی - وشـک بـوونی دەم - سەرئێشـە - كـاريگەری دەبـێ لەسـەر بينـين - هەروەهـا گيراوی(قەبزی)دروســت دەكـــات - دەبێـــتەوە هـــۆی ئاڵودەبوون ئەگەر بۆ ماوەيەكی درێژ بەكاربێ .

### شێوەی دەرمان :

حەب - دەرزی.

# Aluminium-MG

# ئەلومینیوم ئیم جی

**ناوەکانی ترک:**

Almox _ Gelotal _ Maalox

**بەکارهێنان :**

دژی ترشـــــەڵۆکی گەدە، دڵە کـــزێ، برینـــــی گەدە و دوازدەگرێ، هەرس نەکردن، هاوتاکردنی ترشی گەدە .

**کاریگەرک لاوەکی :**

کەمبـــوونەوەی ئـــارەزووی خـــواردن - گیراوی(قەبـــزی) - سکچوو - هێڵنجدان - ڕشانەوە.

**شێوەک دەرمان :**

حەب، شڕوب، تۆز(پاودەر).

# Aluminium Hydroxide

# ئەلومینیوم هایدرۆکساید

**ناوەکانی ترک :-**

: Aludrox _ Alegel

**بەکارهێنان :**

بـۆ دژە ترشـەڵۆکی گەدە، تێکچـوونی گەدە، دڵە کـزێ، برینی گەدە و دوازدەگرێ بەکاردێت .

**کاریگەرک لاوەکی :**

گیراوی، کەمبوونی ئارەزووی خۆراک .

**شێوەک دەرمان :**

حەب - شرِوب - تۆز(پاودەر).

# Acetaminophen + Coddein

## ئەسیتامینۆفین + کوداین

**ناوەکانی ترک :**

Paracod , Co_codamol

**بەکارهێنان :**

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ کەمکردنی ئازارێکی کەم و مامناوەندی لاشە، سەرئێشە، ئازاری ددان.

**کاریگەرک لاوەکی :**

ئەم دەرمانە جگە لە ئەسیتامینۆفین کۆداینی تێدایە کە مادەیەکی بێهۆشکەرە بۆیە ئەگەر بۆ ماوەیەکی درێژ بەکار بێت دەبێتە هۆی ئالودەبوون، کاریگەری تریشی هەیە وەک بێهێزی و گێژبوون و خەوالویی .

**شێوەک دەرمان :**

حەب و حەبی هەلچوو.

# Acetaminophen

## ئەسیتامینۆفین

**ناوەکانی ترک :**

Paracetamol , ParaAzar , Adol , Panadol

**بەکارهێنان :**

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ کەمکردنی ئازارێکی کەم یا مامناوەندی لاشە و سەرێشە، کەمکردنەوەو دابەزاندنی تا، وە هەروەها دەدرێت لەگەڵ چارەسەری هەڵامەت و سەرمای وەرزی .

**کاریگەرک لاوەکی :**

هێڵنج و ڕشانەوە و سکچوون و ئازاری سک و خەوالوویی .

**شێوەک دەرمان :**

حەب ـ دەرزی ـ شرۆب ـ دلۆپ.

# Acyclovir

## ئەسایکلۆڤیر

**ناوەکانی ترک:**

Zovirax , Veramide , Novirax

**بەکارهێنان :**

ئەم دەرمانە بەکاردێت دژی نەخۆشیە ڤایرۆسیەکان وەک تامێسک و مێکوتە و برینی ناو دەم بەهۆی ڤایرۆس و ئێکزیمای پێست و هەڵامەت و سەرمای وەرزی .

**کاریگەرک لاوەکی :**

هەستیاری - خوراندن - هێڵنج ڕشانەوە - تا ، سەرئێشە - سووتانەوەی پێست - لەرزین - سکچوو(ڕەوانی).

**شێوەک دەرمان :**

حەب ـ شڕوب ـ مەرهەم .

**ئاگاداربە!**

ئەم دەرمانە پۆلین دەکرێ بۆ جۆری.(B)

# Allopurinol

# ئەلۆپیورینۆل

**ناوەکانی ترک :**

Zyloric _ Zyloprim _ Alloprin

بەکارهێنـــان : بە کاردێــت بــۆ کەم کــردنەوەی رێــژەی یوریــک ئەســید تــایبەت لە چارەســەرکردنی نەخۆشــی پاشاکان ، (Gout)، (داء الملوک.)

**کارگەرک لاوەکی :**

هێڵنج و ڕشانەوە - زیانی گورچیلە - خورانی پێست .

**شێوەک دەرمان:**

حەب ، دەرزی.

# Adult Cold

# ئەدەڵت کۆڵد

**ناوەکانی ترک :**

Corisan - Dristan

**بەکارهێنان :**

ئەم دەرمـــــانە بەکاردێــــت بـــۆ کەمکـــــردنەوەی کاریگەریەکانی هەلامەت وەک ( تا ، سەرئێشـە ، ئـاو بە لوتا هاتنەخوارەوە).

**کاریگەرک لاوەکی :**

سەر گێژبوون و خەواڵوویی .

**شێوەک دەرمان :**

حەب.

# Aminophylline

## ئەماینۆفایلین

**ناوەکانی ترک:**

phyllocontin, Corophyllin, Truphylline

**بەکارهێنان :**

لە کاتی فریاکەوتن و (ئیمیرجنسی) بۆ هەناسە تەنگی و ڕەبۆ بەکار دێت، هەوکردنی بۆرییەکانی سنگ و هەوا، تەنگەنەفەسی، چارەسەرکردنی هیواش لێدانی دڵ.

**کاریگەری لاوەکی :**

دڵەکوتێ - زیاد بوونی لێدانی دڵ - رشانەوە - هیڵنج.

**شێوەی دەرمان :**

حەب - دەرزی.

## Antihemorrhoid

## ئەنتی هیمۆرۆید

**ناوی ترک :**

Xyloproct

**بەکارهێنان :**

ئەم دەرمانە بۆ کەمکردنەوەی ئازاری کۆم بەکاردێت کە بەهۆی برین یاخود مایەسیری دروست دەبن .

**شێوەی دەرمان :**

مەرهەم - شاف.

## Anethum

## ئەنیسوم

**بەکارهێنان :**

ئەم دەرمانە یەکێکە لە دەرمانە ڕووەکیەکان کە بە مەبەستی کەمکردنەوەی چەوری خوێن بە کار دێت .

**شێوەی دەرمان :**

حەب.

Artificial

# فرمێسکی دەستکترد

**ناوەکانی تر :**

Tearisol _ Lacrisert

**بەکارھێنان:**

بۆ چارەسەری وشکبوونەوەی چاو، قەرەبووکردنەوەی کەمکردنی فرمێسک بەکاردێت.

**کاریگەرک لاوەکی:**

ڕوشانی چاو _ تێکچونی بینین .

**شێوەی دەرمان:**

دڵۆپ.

## Antimigraine

## ئەنتی میگرین

<u>بەکارهێنان:</u>
ئەم دەرمانە یەکێکە لە دەرمانە ڕووەکیەکان بەکاردێت بۆ سەرئێشەی سەرچاوە دەماریەکان.

<u>کاریگەری لاوەکی :</u> گێژی - خەواڵوویی.

<u>شێوەی دەرمان :</u>
دڵۆپ.

# Antihistamine Decongestant

## ئەنتی هیستامین دیکۆنجستانت

**ناوی تر:**

Naldecon

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەری ئاو بە لووتا هاتنەخوارەوە، گیرانی لووت و تا و سەرئێشە و کۆکە و خوران و هەستیاری لووت.

**کاریگەری لاوەکی :**

نەمانی ئارەزووی خواردن، گێژی.

**شێوەی دەرمان :**

حەب.

# Atenolol

# ئەتینۆلۆڵ

__ناوەکانی ترک:__

Tenormin, Tensolol, Vascoten, Alinor

__بەکارهێنان:__

ئەم دەرمانە دژە بەرزی پەستانی خوێنە، وە بەکاردێت بۆ سستی لێدانی دڵ، ناڕێکی لێدانی دڵ.

__کاریگەرک لاوەکی:__

ڕەنگە ببێتە هۆی خاو بوونەوەی لێدانی دڵ، ماندووی، بێ هێزی و خاوبوون، خەواڵویی.

__شێوەک دەرمان:__

حەب.

__تێبینی:__

لە کاتی دووگیانی نابێت بەکاربهێندرێت.

# Atropine

## ئەترۆپین

**ناوەکانی ترک:**

Atropene , atropair , atrosulf

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت لە کاتی فریاکەوتنی خێرا (ئیمێرجنسی) وەک دڵ وەستان، یان لە کاتی ژەهراوی بوون بە مێرووکوژەکانی ئۆرگانۆفۆسفۆر وەک دژە ژەهر بەکار دێت.

**کاریگەری لاوەکی:**

زیادبوونی لێدانی دڵ _ کەم بوونەوەی دەردراوەکانی لەش _ گەورەکردنی بیلبەی چاو _ قەبزی(گیراوی).

**شێوەی دەرمان:**

حەب _ دەرزی _ دڵۆپ.

# B

## Bisoprolol

## بایسۆپرۆلۆڵ

**ناوی تر:**

Concor

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن، نەخۆشی شکستی دڵ یان پەککەوتنی دڵ ل، سستی دڵ، بەکاردێت لە دوای سەکتەی دڵ، بۆ خۆپاراستن لە سنگەکوژێ، کەمکردنەوەی نارێکی لێدانی دڵ.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرگێژبوون - سەرئێشە - ماندوویی - تا - ئازاری قورگ - لاوازی.

**شێوەی دەرمان:**

حەب.

**تێبینی:**

نابێت ئەم دەرمانە بەکاربێت لە لایەن ئافرەتی دووگیان و دایکی شیردەر.

# Bezafibrate

## بێزافایبرەیت

**ناوەکانی تر:**

Bezalip, Epibeza, Zafibral

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی بەرزبونەوەی چەروی خوێن( کۆلیسترۆل )، چارەسەرکردنی بەرزبونەوەی ترای گلایسراید.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرئێشە - ماندوویی - خەواڵوویی- سەرگێژبوون - کەم خوێنی - هەڵوەرینی مووی سەر - سووربوونەوە.

**شێوەی دەرمان:**

حەب.

# Balsalazide

## بۆلسەلزاید

**ناوی تری:**
Colazal

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی مامناوەند و توندی ریخۆڵەکان، ئازاری ریخۆڵەکان، هەوکردنی کۆلۆن.

**کاریگەری لاوەکی:**
تا - ئازاری لەش - سەرئێشە - کەم خەوی - ڕشانەوە - ڕەوانی - کۆکە.

**شێوەی دەرمان:**
کەپسول.

**تێبینی:**
بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری.(B)

# Bisacodyl

# بیزاکۆدیل

**ناوەکانی تر:**

Dulco-lax, Dulcolax, Bisadyl, Dacodyl, Toilax

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەر کردنی گیراوی(قەبزی).

بەکاردێت بۆ بەتاڵ کردنەوەی قۆلۆن بێش ئەنجام دانی نەشتەرگەری یاخود نازوور .

**کاریگەری لاوەکی:**

ڕشانەوە ـ هێڵنج ـ ئازاری سک ـ سکچوو(ڕەوانی).

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شاف.

# Betamethasone + Neomycin

## بێتامیسازۆن + نیۆمایسین

**ناوەکانی ترک:**

Betamethasone N, Beta N, Methadine, Ophtamesone N, Betnovate N

**بەکارهێنان:**

جگە لە دەرمانی بێتامیسازۆن کە دژە هەستیاریە، نیۆمایسینی تیدایە کە ئەنتی بایۆتیکە و دژی هەوکردنە و بۆ چارەسەری هەستیاری پێست بەکاردێت، بۆ چارەسەرکردنی حەساسیەتی پێست، ئەکزیما، بۆ خوراندن، بۆ چارەسەرکردنی هەستیاری و هەوکردن بە هۆی مێرووەکان، بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردن و هەستیاری چاو.

**کاریگەرک لاوەکی:**

ڕووشانی پێست، دروست بوونی پەڵە لە ئەگەری زۆر بەکارهێنان .

**شێوەک دەرمان:**

دڵۆپ ـ مەرهەم ـ کرێم.

# Betamethasone

## بێتامیسازۆن

**ناوەکانی ترک:**

Celestone, Betnovate, Diprosone, Betaderm, Betnesol ،Betasone, Betapred

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەستیاری پێست، بۆپێوەدانی مێروو، هەستیاری چاو، هەوکردنی چاو، سووربوونەوەی پێست .

**کاریگەرک لاوەکی:**

تێکچوونی بینین، فرمێسک ڕشتن، درەنگ چاک بوونەوەی برین .

**شێوەک دەرمان:**

حەب، دەرزی، شرۆب، دڵۆپ، مەرهەم.

## Betadine

## بێتادین

**ناوەکانی ترک:**
polyvidone iodine, iodopovidone

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە گیراوەیە بەکاردێت بۆ پاککردنەوە و شووشتنەوەی برینەکانی پێست و هەوکردنەکان .

**شێوەی دەرمان:**
گیراوە - پرژێن(سپرای)- تۆز.

## Benzoyl Peroxide

## بنزۆیل پیرۆکساید

**ناوەکانی ترک:**
Benoxyl. ،Panoxyl Acne, Ben – oxide

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە دژی بەکتریایە وە بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی زیپکە (حب الشباب)، لابردنی زیپکەی ڕوخسار.

**کاریگەری لاوەکی:**

هەستیاری، وشکبوونی پێست، سووتانەوە، هەوکردنی پێست.

**شێوەی دەرمان:**

مەرهەم، جێڵ، سابون، گیراوە، لوشن.

## Beclomethasone

## بیکلۆمیسازۆن

**ناوەکانی تری:**

Beconase, Beclo

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی حەساسیەتی درێژخایەنی لووت، بەکاردێت بۆ نەخۆشی ڕەبۆ، بەکاردێت بۆ هەوکردنی لووت، بەکاردێت بۆ هەناسەتەنگی .

**کاریگەری لاوەکی:**

هەوکردنی قورگ و بۆڕی هەوا، سەرێشە .

**شێوەی دەرمان:**

پرژێن(سپرا).

# Baclofen

# باکلۆفین

**ناوەکانی تر:**

Lioresal, Kemstro, Gablofen

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەری ئازاری لەش، بۆ خاو کردنەوەی پەیکەرە ماسولکە لە کاتی گرژبوونی ماسولکە و دەمارەکان، ئازاری پشت، ئازار و بریندار بوونی فقرات (درکەپەتک)، ئازاری درێژخایەنی لەش.

**کاریگەری لاوەکی:**

خەوالوویی _ سەرگێژبوون _ سەرئێشە _ تێکچوونی سیستەمی خەو _ تێکچوونی بینین _ ڕشانەوە _ هێڵنجدان _ نزم بوونەوەی پەستانی خوێن.

**شێوەی دەرمان:**

حەب _ دەرزی.

# Bromhexine

# برۆمهێکسین

**ناوەکانی تر:**

Solvodin, Bisolvon, Mucolyte, Solvin

**بەکارهێنان:**

بۆ چارەسەر کردنی کۆکەی تەڕ (کاتێک بەڵغەمت هەبێت) بەکار دەهێنرێت، وە بەکاردێت بۆ چارەسەری هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە.

**کاریگەری لاوەکی:**

ڕشانەوە ـ هێڵنج ـ ئازاری سک .

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دڵۆپ ـ شرۆب ـ دەرزی.

# C

## Chlorpromazine

## کلۆرپرۆمازین

**ناوەکانی تری:**

Largactil

**بەکارهێنان:**

چارەسەرکردنی هەندێ نەخۆشی دەروونی وەکو شیزۆفرینا، ناتەواوی جوڵەی و هەلسەوکەوتی رۆژانە، بەکاردێت بۆ نەهێشتنی رشانەوە و هێلنج، هێمن کردنەوەی نەخۆش، نەخۆشی نسکرە، دڵەڕاوکێ و هەڵچوون.

**کاریگەری لاوەکی:**

خەواڵویی ـ گێژبوون ـ ناتەواوی گەدە ـ وشکی دەم.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دەرزی ـ شروب.

**تێبینی:**

نابێت بەکاربێت لەکاتی دووگیانی. نابێت بەکاربێت لە کاتی شیرپێدان کاریگەری دەبێت لەسەر کۆرپەلە.

# Clobutinol

# کلۆبوتینۆڵ

**ناوەکانی تر:**

Silomat, Lomisat

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە دەرمانێکی دژە کۆکەیە بەکاردەهێندرێت دژی کۆکەی وشک و کۆکەی توند.

**کاریگەری لاوەکی:**

گێژبوون - خەواڵوویی - هێڵنجدان - بێخەوی.

**شێوەی دەرمان:**

حەب - دڵۆپ - دەرزی.

# Chlorpropamide

## کلۆرپرۆپامايد

**ناوەکانی ترک:**

Diabi-nese

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی بەرزبونەوەی شەکری خوێن لە جۆری دووەم – کەمکردنەوەی شەکری خوێن.

**کاریگەرک لاوەکی:**

کەمبوونی ئارەزووی خواردن ـ هەستیاری ـ گێژبوون ـ سەرئێشە.

**شێوەک دەرمان:** حەب.

# Clofibrate

# کلۆفایبرێیت

**ناوەکانی تر:**

Atromid S

**بەکارهێنان:**

دەرمـــانێکە بەکاردێــت بــۆ دابەزانــدنی ڕێــژەی هەردوو جۆری چەوری (Triglycride) و.(Cholesterol)

**کاریگەرک لاوەکی:**

هێڵنجدان و ڕشانەوە ـ سەرئێشە ـ خەواڵوویی ـ گێژبـوون ـ کەم بـونەوەی ئـارەزوی سێکســی ـ دابەزینـی کـێش ـ هەڵوەرینی موو ـ بێهێزی.

**شێوەی دەرمان:** کەپسول.

**تێبینی:**

ئەم دەرمــانە لەکــاتی دووگیــانی و شــیرپێدان نابێــت بەکاربێت.

# Clidinium-C

# کلیدینەم-سی

**ناوەکانی ترک:**

Librax, Clidinium bromide + Chlordiazepoxide

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی برینی گەدە و دوانزەگرێ, ئەتوانرێت بەکاربێت بۆ چارەسەرکردنی گرژبوونی ماسولکەکانی سک و خاوکردنەوەیان, نەخۆشی کۆلۆن.

**کاریگەرک لاوەکی:**

خەواڵوویی ـ وشک بوونی دەم ـ سەرئێشە ـ ناتەواوی جنسی ـ لاوازی ـ هێڵنج ـ ناتەواوی بینین .

**شێوەک دەرمان:** حەب.

**تێبینی:**

نابێت وەربگیرێت لەکاتی دووگیانی.

نابێت وەربگیرێت کاتی شیرپێدان.

# Chlordiazepoxide

# کلۆردیازیپۆکساید

**ناوەکانی تری:**

Librium

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی خەمـۆکی، دڵەراوکـێ، گرژبـوونی دەمارەکـان، دەرهێنـانی کحول لە لەش، خەولێخەر، ئارام کردنەوە.

**کاریگەری لاوەکی:**

خەواڵوویی ـ ماندوویی ـ پەڵەی پێست ـ دەم وشکبوون.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**تێبینی:**

زیانی هەیە بۆ ئافرەتی دووگیان.

# Chlorpheniramine maleate

## کلۆرفنیرامین مالی ئێیت

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە دژە هیستامینە، بەکاردێت بۆ چارەسەری هەستیاری، هەستیاری پێست و خورانی و سوربوونەوەی .

بەکاردێت بۆ چارەسەری گیرانی لووت و ئاوهاتن لە لووت بەهۆی هەڵامەت .

**کاریگەری لاوەکی:**

گێژبوون ـ خەواڵوویی ـ وشکی دەم ـ ماندوویی.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دەرزی ـ شروب .

**تێبینی:**

نابێت ئەم دەرمانە بەکاربێت لە کاتی سکپڕی، نابێت بەکاربێت لە کاتی شیر پێدان کاریگەری دەبێت لەسەر کۆرپەلە .

نابێت لەکاتی هەبوونی نەخۆشی پرۆستات لە پیاوان بەکاربێت.

# Clemastine

# کلێماستین

**ناوەکانی ترک :**

Tavegyl

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە یەکێکە لە دەرمانە دژە هیستامینەکان بە کاردێت دژی هەستیاری و لیر، خورانی پێست ئێکزیما.

**کاریگەرک لاوەکی:**

گێژبوون ـ خەوالّوویی ـ هێلّنج ـ دەم وشک بوون .

**شێوەک دەرمان:**

حەب ـ شرۆب.

# clobetasole

# کلۆبیتازۆڵ

**ناوەکانی ترک:**

Dermodin, Dermovate, Temovate, Clobetomac.

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە لەکاتی هەوکردنەکانی پێست و خورانی پێست بەکاردێت، هەروەها بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی پێست کە بە سۆریاسیز (Psoriasis) ناسراوە، یاخود لای خۆمان ناسراوە بە(سەدەف).

**کاریگەری لاوەکی:**

سووتانەوە ـ وشک بوونی پێست ـ خوران.

**شێوەی دەرمان:**

مەرهەم ـ شامپۆ.

**تێبینی:**

باشترە لە کاتی دووگیانی و شیرپێدان بەکارنەیەت.

# Clomipramine

# کلۆمیپرامین

**ناوەکانی ترک:**
Anafranil

**بەکارهێنان:**
کلۆمیپرانین دەرمانێکی دژە خەمۆکیە بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی خەمۆکی، ڕاڕاییی، ترس، ژانی دووبارە بوونەوەی درێژ خایەن.

**کاریگەرک لاوەکی:**
وشک بوونی دەم . وشک بوونی چاو . تێکچوونی بینین . خەواڵوویی . نارێکی پەستانی خوێن . سەرئێشە . هەستیاری . گیراوی . سکچوو .

**شێوەک دەرمان:**
حەب و کەپسول.

# Clotrimazole

# کلۆتریمازۆڵ

**ناوەکانی ترک:**
Canesten, Mycelex

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمـانە دژە کەڕووە، بە کاردێـت لە چارەسـەرکرنی هەوکردنـی کۆئەنـدامی زاوزێ بە هـۆی کەڕووەکـان لە ئافرەتانـدا, هەروەها بەکاردێت بـۆ لەنـاوبردنی کەڕوو لە نینۆک و پێستی سەر .

**کاریگەری لاوەکی:**
ڕووشانی شوێنی بەکارهێنان ـ هەستیاری ـ سووتانەوە.

**شێوەی دەرمان:**
کرێم ـ شاف ـ دڵۆپ.

# Contraceptive

# کۆنتراسێپتیڤ

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ ڕێگری لە سکپڕی .

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرئێشە ـ گێژبوون ـ زیپکە ـ هێڵنجدان ـ گیراوی ـ سکچوون ـ ئازاری سک ـ بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن.

**تێبینی:**

بەکارهێنانی ئەم دەرمانە لە کاتی شیرپێدان ئاساییە و ڕێگەپێدراوە.

# Cyproheptadine

## سیپرۆهیپتادین

**ناوی تر:**

Periactin

**بەکارهێنان:**

چارەسەرکردنی هەستیاری لەش، هەستیاری لووت، هەستیاری پێلوی چاو و چاو، بەکاردێت بۆ زیادکردنی ئارەزووی خواردن.

**کاریگەری لاوەکی:**

خەوالوویی ـ گێژبوون ـ زیادبوونی کێش ـ ناتەواوی بینین ـ وشکبوونی دەم ـ نارێکی لێدانی دڵ ـ نزم بوونی پەستانی خوێن.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شروب.

**تێبینی:**

نابێت بەکاربێت لە لایەن دایکی شیردەر.

# Chloramphenicol

# کلۆرامفینیکۆڵ

**ناوی تر:**

Cholomycetin

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمـــانە لە دەرمـــانە ئەنتـــی بایۆتیکیەکـــانە(دژە زیندەییەکان) چارەسەرکردنی هەوکردنی برینی لەش بە هـۆی بەکتریاکـانەوە، نەخۆشـی هەوکردنـی پەردەکـانی مێشـک, بەکاردێـت بـۆ نەخۆشـی گرانەتـا, هەوکردنـی پێست و شانەکانی لەش، هەوکردنی چاو و پێلوی چاو و ڕەشێنەی چاو، هەوکردنی کۆئەندامی میز و میزەڕۆ.

**کاریگەری لاوەکی:**

هێڵنج ڕشانەوە ـ سکچوون ـ وشکی دەم ـ کەم خوێنی .

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دەرزی ـ مەرهەم ـ دڵۆپ.

# Children Cold

# چیلّدرین کۆلّد

**ناوەکانی تری:**

Demilets

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بۆ منداڵان بەکاردێت بۆ کەمکردنەوەی نیشانەکانی پەسیوی(هەڵامەت)، دژی هەستیاری و ئازار و تا و هەوکردنە .

**کاریگەری لاوەکی:**

خەواڵوویی ـ گێژبوون ـ بێهێزی ـ سکچوون(ڕەوانی) ـ گیراوی.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شروب.

# Charcoal

# چارکوڵ

**ناوەکانی تر:**

Charcoaid

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بە کاردێت بۆ چارەسەری ژەهراوی بوونی کۆئەندامی هەرس، ژەهراوی بوون بە ماددەی کیمیاوی و دەرمان، هەروەها دژی سکچوو، دژی غازاتی سک بەکاردێت .

**کاریگەری لاوەکی:**

هێڵنجدان - ڕەوانی - گیراوی - خوێنبەربوون - ڕەشبوونی پیسایی - کەم بوونی سۆدیۆم و کالیسیۆم .

**شێوەی دەرمان:**

حەب - شڕوب.

# Cephalexin

# سیفالێکسین

**ناوی تر:**

Keflex

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە لە ریزی ئەنتی بایۆتیکەکانە و بەکاردێت بۆ بۆچارەسەری هەوکردنە بەکتریاییەکان و میکرۆبیەکان .

چارەسەرکردنی هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە وەکو قورگ و گوێ ی ناوەراست و لووت و سورێنچک و ئالووەکان، هەوکردنی پێست و شانەکان و ئێسک، هەوکردنی ددان، هەوکردنی کۆئەندامی میز و میزەرۆ وەکو میزڵدان و گورچیلەکان، هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ, بەکاردێت لە دوای نەشتەرگەری بۆ نەهێشتنی هەوکردن.

**کاریگەری لاوەکی:**

سکچوون ــ ئازاری سک ــ هێڵنج و ڕشانەوە ــ هەستیاری .

**شێوەی دەرمان:** حەب و شروب.

# Carbamazepin

## کاربامازیپین

**ناوەکانی ترک:**
Tegretol, Hermolepsin

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە یەکێکە لە دەرمانە دژە گرژی و دژە ئازارەکان بەکاردێت بۆ کەسێک کە فیی بۆ بێت، بۆ کەسانێک کە هۆگری ماددەی کحولییەکانن.

**کاریگەرک لاوەکی:**
خەواڵوویی ـ گێژی ـ هەستیاری پێست ـ هێڵنج ـ وشک بوونی دەم ـ کەم بوونی ئارەزووی خواردن .

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**تێبینی:**
نابێت بەکاربێت لەکاتی دووگیانیدا.

# Celecoxib

## سیلێکۆکسیب

**ناوەکانی تری:**
Celebrex

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە دژە ئازار و دژە هەوکردنە بە شێوەیەکی گشتی، نەهێشتنی ئازاری پەیکەرە ماسولکە, ئازار و هەوکردنی جومگەکان, ئازاری پشت و ئێسک, سەوەفان, ئازاری ددان, ئازاری سوڕی مانگانە لە ئافرەتان, ئازاری توند و مام ناوەندی لەش, هەوکردنی ڕۆماتیزمی.

**کاریگەری لاوەکی:**
ڕشانەوە ــ سکچوون ــ سەرئێشە ــ تێکچوونی کۆئەندامی هەرس ــ بەرزبوونەوەی فشاری خوێن ــ کۆکە .

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**تێبینی:** نابێت وەربگیرێت لە کاتی سکپڕی.

## Calcium supplement

## تەواوکەرەکانی کالیسیۆم

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەری ئێسکە نەرمە و پوکانەوەی ئیسک، ڕێژەی کالیسیۆم لە خوێندا زیاد دەکات .

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شروب _ دەرزی.

## Calamine - D

## کالاماین دی

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ دژە هەستیاری، بەکاردێت بۆ دژە خوران و مێکوتە .

**کاریگەری لاوەکی:**

بۆی هەیە هەوکردنێکی کەم دروست بکات .

**شێوەی دەرمان:** لۆشن ـ مەرهەم.

# Captopril

# کاپتۆپریل

**ناوەکانی تری:**

Capoten, Midopril, Milcapton

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی پەستانی خوێنی بەرز و مامناوەند و نزم، سەکتەی دڵ، پەککەوتنی دڵ، هەروەها وەک چارەسەر بۆ شەکرەی گورچیلەیی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:**

هێڵنج ـ ڕشانەوە ـ ئازاری سک ـ دڵە کوتێ ـ نزم بوونەوەی لێدانی دڵ ـ ئازاری سنگ.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

## Calendula
## كالێندولا

**بەكارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەكاردێت بۆ چارەسەری قڵیشانی پێست، وشكی پێست، هەستیاری پێست، پێوەدانی مێروو، سووتانی بەر خۆر .

**شێوەی دەرمان:**

ئەم دەرمانە لە دەرمانە ڕووەكیەكانە و بەشێوەی مەرهەم دەست دەكەوێ.

## Cloral hydrate
## كلۆراڵ هایدرێیت

**ناوەكانی تر:**

Somnote, Welldorm

**بەكارهێنان:**

دەرمانێكی هێوركەرەوەیە، خەوهێنەرە، بۆ كەم كردنەوەی فشار و دڵە ڕاوكێ بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی:**

خەواڵویی ـ گێژبوون ـ سكچوو ـ كەمبوونەوەی ئارەزوی خواردن .

**شێوەی دەرمان:** شروب.

# Cholecalciferol (Vitamin D)

# کۆلی کالسیفیرۆل

**ناوەکانی ترک:**

٣ Vit D

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمـــانە بەکاردێــت بــۆ ئەو کەســانەی ڕێــژەی کالیسیۆمیان کەمە .

**کاریگەری لاوەکی:**

هێلنج ـ ڕشانەوە ـ ماندوویی .

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دەرزی.

# Cholestyramine

# کۆلیستیرامین

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ چارەسەری ئەو کەسانەی ڕێژەی چەوری ( کۆلیستیرۆل)ی خوێنیان بەرزە .

**کاریگەرى لاوەکی:**

گێژبوون ـ خەواڵویی ـ سەرئێشە.

**شێوەی دەرمان:**

تۆز(پاودەر) .

**تێبینی:**

پێویستە ئەم دەرمانە لە ژێر چاودێری پزیشک بەکاربێت.

# Cimetidine

# سایمیتیدین

**ناوەکانی ترک:**

Tagamet

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی برینی گەدە و دوانزەگرێ, بۆ قەدەغەکردنی دروست بوونی برینی گەدە و دوانزە گرێ , کەم کردنەوەی زیاد دەردانی ترشێتی گەدە, سوتانەوەی گەدە, نەخۆشی بەدهەرسی, بۆ خۆپاراستن لە خوێن بەربوونی گەدە و دوانزەگرێ, دەتوانرێت بەکاربێت لەگەڵ دەرمانە ئازارشکێنەرەکان بۆ نەهێشتنی دروستبوونی برینی گەدە و پاراستنی چینی ناوەوەی گەدە.

**کاریگەرک لاوەکی:**

گێژبوون ـ خەواڵویی ـ سکچوون ـ سەرئێشە ـ ڕشانەوە و هێڵنج.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دەرزی ـ شرۆب .

**تێبینی:**

نابێت بەکاربێت بۆ ئافرەتی دووگیان.

نابێت بەکاربێت لە کاتی شیرپێدان.

# Clonazepam

# کلۆنازیپام

**ناوەکانی ترک:**

Clonopin ،: Rivotril

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی گەشکە, گرژی ماسولکەکانی لەش, چارەسەرکردنی دڵەراوکێ و خەمۆکی, هیورکردنەوە, تێکچوونی دووجەمسەری.

کاریگەری لاوەکی: سەرگێژبوون ـ خەواڵوویی ـ لەرزین ـ هێلنج ـ قەبزی ـ ناڕێکی پەستانی خوێن ـ بەرزبوونەوەی لێدانی دڵ ـ تەنگەنەفەسی.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دەرزی ـ دڵۆپ.

**تێبینی:**

نابێت بەکاربێت لە لایەن ئافرەتی دووگیان و شێردەر چونکە کاریگەری لەسەر کۆرپەلە هەیە.

# Cloxacillin

# کلۆکزاسیلین

## ناوەکانی ترک:

Cloxacilla, Cloxapen, Orbenin

## بەکارهێنان:

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی بەکتریایی تایبەت بەهۆی ستافیلۆ کۆکەس, (Staphylococcus) هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە، هەوکردنی دەم و پێست، هەوکردنی کۆئەندامی میزومیزەڕۆ، هەوکردنی سی یەکان، هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ.

## کاریگەری لاوەکی:

گێژبوون ـ خەواڵوویی ـ لەرزینی دەست ـ سکچوو ـ ڕشانەوە ـ ئازاری سک ـ دڵە کوتێ ـ گەشکە.

## شێوەی دەرمان:

کەپسول ـ شرۆب.

# Coal tar

# کۆڵ تار

**ناوەکانی تر:**

Polytar

**بەکارهێنان:**

بـۆ چارەسـەرکردنی کرێشـی سـەر و پێسـت، ئەکزیمـا، هەوکردنی پێست، چارەسەری سۆریاسس.

**کاریگەری لاوەکی:**

هەستیاری پێست ـ زیپکە ـ هەستیاربوون بە ڕوناکی.

**شێوەی دەرمان:**

شامپۆ ـ لۆشن.

# Cholchicine

# کۆلچیسین

**ناوەکانی ترک:**
Colchimax, Colgout

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ چارەسەری نەخۆشی پاشاکان)دا المولک، گۆشت گره(gout ، هەروەها بەکاردێت بۆ هەوکردنی جومگەکان.

**کاریگەری لاوەکی:**
هێلنج ـ ڕشانەوە ـ ئازاری سک ـ سکچوو ـ پەڵە ـ کەمخوێنی ـ هەڵوەرینی موو.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

# Co-trimoxazole

## کۆتریموکسازۆل

**ناوەکانی تر:**

Sulfamexazole, Bactrim, Co-trim, Septriam, Metheprim, Eusaprim

**بەکارهێنان:**

بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی کۆئەندامی میز و میزەڕۆ، ڕێڕەوی هەناسە، هەوکردنی گەدە و ڕیخۆڵە، هەوکردنی گوێی ناوەڕاست، سکچوو بەهۆی بەکتریا.

**کاریگەری لاوەکی:**

هێلنجدان و ڕشانەوە ـ هەستیاری پێست ـ کەمبوونی ئارەزوی خواردن ـ سەرئێشە.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شرۆب.

D

# Diphenoxylate + Atropine Sulfate

## دایفینۆگزیلێیت و ئەترۆپین

**ناوەکانی ترک:**

EntroStop, Lomotil

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی سکچوون، کەم کردنەوەی جوولەی گەدەو ڕیخۆڵەکان، وەستان و کەمکردنەوەی ڕەوانی.

**کاریگەرک لاوەکی:**

خەواڵوویی ـ ئازاری سک ـ نەمانی ئارەزووی خواردن ـ سەرئێشە ـ تا ـ وشک بوونی دەم ـ قەبزی ـ سەگێژبوون ـ ڕشانەوە.

**شێوەک دەرمان:**

حەب ـ شرۆب.

# Diltiazem

# دیلتیازیم

**ناوەکانی تری:**

Cardizem, Dilacor, Tiazim, Altiazem

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی سنگە کوژە بەردەوام و درێژخایەن، دابەزینی پەستانی خوێن، ناتەواوی گوێچکەلەکان، خێرایی لێدانی دڵ، شۆکی دڵ، شکستی دڵ.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرئێشە - خەوالوویی - کەمبوونی لێدانی دڵ - سکچوون(ڕەوانی) - ڕشانەوە - پرۆستات.

**شێوەی دەرمان:**

حەب - دەرزی.

# Diphenhydramine Compound

## دایفین هایدرامین کۆمپاوند

**بەکارهێنان:**

بۆ چارەسەری سەرمابوون و دژی کۆکە و هەستیاری و بۆ کپکردنەوەی کۆکە و هەستیاری لووت بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:**

خەواڵوویی - بێخەوی - لەرزین - سەرئێشە - گێژبوون - وشک بوونی دەم - قەبزی - ڕەبۆ.

**شێوەی دەرمان:**

شرۆب.

# Dimethicon

# دایمێسیکۆن

**ناوەکانی ترک :**

Degas, Mylicon

**بەکارهێنان:**

بۆ چارەسەری بای سک(غازات) بەکاردێت، هەروەها وەک دەرمانی یاریدەدەر لە برینی گەدە و ڕیخۆڵە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:**

سووتانەوە ـ دڵە کزێ ـ سکچوو ـ قەبزی ـ لەرزین.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دڵۆپ.

# Dimenhydrinate

## دایمین هایدرینێیت

**ناوەکانی ترک:**

Dramamine

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمـــانە بەکاردێـــت بە مەبەســـتی ڕێگریکـــردن لە هێڵنجدان و ڕشانەوە و سەرگێژبوون، هەروەها زیاتر بۆ ئەو کەســـانە بەکاردێـــت کە نەخۆشـــی تێکچـــوون بە جوولەیـــان هەیە تـــایبەت لە کـــاتی گەشـــت کـــردن بە ئۆتۆمۆبیل یان شەمەندەفەر یاخود فڕۆکە.

**کاریگەرک لاوەکی:**

خەواڵوویی ـ وشکی دەم ـ نارێکی لیدانی دڵ.

**شێوەک دەرمان:**

حەب ـ شرۆب ـ دەرزی.

**تێبینی:**

ئەم دەرمانە بۆ دایکی شیردەر ڕێگەپێدراو نیە.

# Digoxin

# دیگۆکسین

**ناوەکانی ترک:**

Lanoxin

**بەکارهێنان:**

چارەسەرکردنی نارێکی لێدانەکانی دڵ, نەخۆشی پەککەوتنی دڵ, سستی دڵ, چارەسەرکردنی زۆربوون و خێراتربوونی لێدانەکانی گوێچکەڵە, نەخۆشی لەرینەوەی گوێچکەڵەکان.

**کاریگەرک لاوەکی:**

تێکچوونی کۆئەندامی هەرس ـ لاوازبوونی ماسولکە ـ سەرئێشە ـ هیلاکبوون ـ هێلنجدان ـ ڕشانەوە ـ نزمبوومەوەی پەستانی خوێن.

**شێوەک دەرمان:**

حەب ـ دەرزی ـ شرووب ـ دلۆپ.

# Digestive

# دایجێستیڤ

**ناوەکانی ترک:**

Festal, Onoton

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەری نەخۆشی گەدە و ڕیخۆڵە، تێکچوونی هەرس، ئازاری سک بەهۆی با (غازات).

**کاریگەرک لاوەکی:**

سکچوون ـ هێڵنجدان ـ ئازاری سک.

**شێوەک دەرمان:**

حەب

# Dicyclomine

## دایسایکلۆمین

**ناوەکانی ترک:**

Dilomine ،Bentylol, Formulex

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ کەم کردنەوەی گرژبوونی لوسە ماسولکە، کەمکـــردنەوەی ئـــازاری دەزگـــای هەرس، هەوکردنـــی ڕیخۆڵەکان، برینی گەدە، برینی دوانزەگریێ، ئازاری بۆڕی میـــز، بەکاردێـــت بـــۆ نەهێشـــتنی ئـــازاری ســـک لە شیرخۆران.

**کاریگەرک لاوەکی:**

خەواڵـوویی - وشـکبوونی دەم - هەسـتیاری - تـا - بـێ ئارامی - ڕشانەوە - قەبزی.

**شێوەک دەرمان:**

حەب - دەرزی - شرپوب.

**تێبینی:**

ئەم دەرمانە بۆ دایکی شیردەر نابێت بەکاربێت.

# Diclofenac

## دیکلۆفیناک

**ناوەکانی ترک:**

Voltaren, Diovon, Olfen, Zipsor, Rapiflam, Catafen, Dicuno, Eeze, Ignorin.

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی جومگەکان، ئازاری کەم و مامناوەند، ڕۆماتیزم، ئازاری ددان، پەیکەرە ماسوولکە، پشت و مل، سووڕی مانگانە.

**کاریگەری لاوەکی:**

گێژبوون ـ هێڵنجدان ـ خەواڵوویی ـ ناتەواوی کۆئەندامی هەرس ـ سەرئێشە ـ سکچوو.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دەرزی ـ دڵۆپ ـ لەزگە ـ پرژێن(سپرا).

**تێبینی:**

لە دایکی شیردەر نابێت بەکاربێت.

# Diazepam

# دیازیپام

**ناوەکانی تر:**

Valium, Diazemuls, Stesoild, Apozepam

**بەکارهێنان:**

خەوهێنەر و هێورکەرەوەیە، بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی دڵە ڕاوکێ، خەمۆکی، دژی فێ و لەرزین و گرژبوونی ماسولکە و ترس و ڕاڕایی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:**

گێژبوون ـ خەواڵوویی ـ لاوازی ماسولکە، دابەزینی پەستانی خوێن، تێکچوونی بینین.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دەرزی ـ شرووب.

**تێبینی:**

ئەم دەرمانە لەکاتی دووگیانی و شیرپێدان ڕێگەپێدراو نیە.

# Dextromethorphan

# دکسترۆمیسۆرفان

**ناوەکانی ترک:**

Sedilar, Sedatuss

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی کۆکەی ووشک، هەستیاری و هەوکردنی قورگ، هەلامەت، هەوکردنی بۆری هەناسە.

**کاریگەری لاوەکی:**

گێژبوون ـ خەواڵوویی ـ قەبزی ـ هێڵنجدان و ڕشانەوە ـ تێکچوونی هەرس.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شرِوب ـ دڵۆپ.

# Dexpanthenol

# دکسپانسینۆڵ

**ناوەکانی ترک:**

Panthenol, Ilopan, Dexanol

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی کەم لە پێست، بۆ چارەسەرکردنی برین، بۆ شەقبوونی پێست، شەق بوونی کۆم، نەخۆشی درێژخایەتی پێست، بۆ چارەسەرکردنی سووتانی خۆر، هەستیاری پێست، سووتانەوەی پێست، ئەکزیما، خوران، ڕووشانی پێست، وشکبوونی پێست.

**کاریگەرک لاوەکی:**

ڕووشانی پێست ـ پەڵە.

**شێوەک دەرمان:**

حەب ـ مەرهەم.

# Dexchlorpheniramine

# دیکسکلۆرفنیرامین

**ناوەکانی ترک:**

Polaramine

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەستیاری لووت، هەوکردنی لووت، هەستیاری لەش، بۆ پێوەدانی مێروو، هەوکردنی پێست، ئاوی لووت و پژمین.

**کاریگەری لاوەکی:**

گێژبوون ـ خەواڵوویی ـ کەم خوێنی.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شرۆب ـ دەرزی.

# Dexamethasone

## دیگزامیسازۆن

**ناوەکانی ترک:**

Decadrone, Dexon, Maxidex, Apidex, Dekort, Decacorte, Millicorten, Deltafluoren

**بەکارهێنان:**

هەستیاری توند، هەوکردن، ئاوسانی مێشک، شێرپەنجەی مێشک و سنگ و پرۆستات، هەوکردنی چاو، هەوکردنی پێست، ڕشانەوە و هێلنج لەکاتی چارەسەرکردن بە دەرمانەکانی شێرپەنجە، ڕۆماتیزم، شێرپەنجەی خوێن، هەوکردنی گورچیلە و جگەر.

**کاریگەری لاوەکی:**

زیپکە ـ پەڵە ـ پووکانەوەی ئێسک ـ زیادبوونی شەکرەی خوێن ـ لاوازی ماسولکەیی ـ بەرزبونەوەی پەستانی خوێن ـ دروست بوونی ئاوی سپی لە نێو چاو.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دەرزی ـ شروب ـ دڵۆپ.



Enalapril

## ئینالاپریل

**ناوەکانی ترک:**

Renitec, Vasotec, Lotrial, Anapril

**بەکارهێنان:**

بۆ چارەسەرکردنی فشاری خوێن لەو کەسانەی پەستانی خوێنیان نزمە، بۆ چارەسەرکردنی سستبونی دڵ.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرئێشە ـ گێژبوون ـ کۆکەی وشک.

**شێوەی دەرمان:**

حەب.

# Ergotamine ـ C

# ئێرگۆتامین ـ سی

**ناوەکانی تر:**

Cafatine

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەر و هێورکردنەوەی ئازاری نیوە ژانەسەر (سەراسێ ـ شقیقە).

**کاریگەری لاوەکی:**

خەواڵوویی ـ هێڵنج ـ ڕشانەوە ـ بێخەوی ـ سکچوو ـ بێهێزی ـ ئازاری سک ـ ئازاری قەفەسەی سنگ ـ خوران.

**شێوەی دەرمان:**

حەب.

**تێبینی:**

بەکارهێنانی ئەم دەرمانە لە کاتی دووگیانی ڕێگەپێدراو نیە.

# Erythromycin

## ئرسرۆمایسین

**ناوەکانی ترک:**

Ery-Max, E-mycil, Ro-mycin, Eryderm, Abboticin

**بەکارهێنان:**

دژی هەوکردن بەکاردێت لە کاتی هەبوونی ڕێژەیەکی زۆری بەکتریا، بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی قورگ و بۆڕی هەناسە، کۆئەندامی هەناسە و سییەکان و گوێ و لووت و پێست (زیپکە)و چاو و پێڵووی چاو و ڕیخۆڵە.

**کاریگەرک لاوەکی:**

تێکچوونی کۆئەندامی هەرس ـ هەستیاری لە پێست ـ ئازاری سک ـ هێلنج.

**شێوەک دەرمان:**

حەب ـ شرۆب ـ مەرهەم.

**تێبینی:**

لە کاتی دووگیانی نابێت بەکاربێت.

# Estrogens Conjugated

# ئیسترۆجین کۆنجیۆگێیت

**ناوەکانی تر:**

Premarin, Cenestin, Progens

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ، چارەسەرکردنی خوێن بەربوون، سستی هێلکەی ئافرەت، نەزۆکی، زیادبوونی غودەی دەرەقی.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرئێشە - سەرگێژبوون - ڕشانەوە - ڕەوانی(سکچوو) - ناتەواوی سوڕی مانگانە.

**شێوەی دەرمان:**

حەب - دەرزی - مەرهەم.

**تێبینی:**

بۆ ئافرەتی دووگیان نابێت بەکاربێت.

بۆ دایکی شیردەر نابێت بەکاربێت و کاریگەری هەیە لەسەر کۆرپەلە.

# Expectorant

## ئێکسپێکتۆرانت

**بەکارهێنان:**

دژی کۆکە و بەڵغەمە، هەروەها بەکاردێت بۆ چارەسەری نیشانەکانی کۆکە و گیرانی لووت بەهۆی سەرمابوون و هەستیاری، هەوکردنی بۆڕی هەناسە.

**کاریگەری لاوەکی:**

خەواڵوویی - هێڵنجدان - ڕشانەوە.

**شێوەی دەرمان:**

شرووب.

**تێبینی:**

ئەم دەرمانە بۆ خوار تەمەن ٢ ساڵ پێشنیاز ناکرێ.



# Famotidine

## فامۆتیدین

**ناوەکانی ترک:**

Famotal ، Pepcid

**بەکارهێنان:**

بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی برینی گەدە و دوانزەگرێ, چارەسەرکردن یان کەمکردنەوەی گەرانەوەی ترشەلۆکی گەدە Hcl بۆ سورێنچک, ئەتوانرێت وەکو خۆپاراستن بەکاربێت بۆ دروست نەبوونی حالەتەکانی زۆری دەردانی ترشی گەدە و برینی گەدە و دوانزەگرێ, گرژبوونی کۆلۆن, نەخۆشی دڵەکزێ , هەوکردنی سورێنچک بە هۆی گەرانەوەی ترشێتی گەدە, نەخۆشی ZES.

**کاریگەرک لاوەکی:**

سەرئێشە ـ خەواڵوویی ـ هێڵنج ـ ئازاری سک ـ سوربوونەوە و خورانی پێست ـ قەبزی ـ خوێن بەربوونی گەدە ـ ئازاری ماسولکە ـ کەم بوونی ئارەزووی خواردن.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شرۆب ـ شاف.

**تێبینی:**

بۆ تەمەنی خوار ١٦ ساڵی نابێت بەکاربێت، لە کاتی دووگیانی نابێت بەکاربێت، بۆ دایکی شیردەر نابێت بەکاربێت.

# Ferrous sulphate
# فێرۆس سەڵفەیت

**ناوەکانی ترک:** Ferodan, Ferosam

**بەکارھێنان:**

بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی کەمی ئاسن یاخود کەمخوێنی بەھۆی کەمی ئاسن بەکاردێت, بەکاردێت بۆ بێ تاقەتی و لاوازی لەکاتی ماوەی سکپری لە ئافرەتاندا بە هۆی کەمی ڕێژەی خوێن لە لەشدا, وە بەکاردێت لەسەرەتای ماوەی سکپری لە ٣ مانگی یەکەم بۆ نەهێشتنی توشبوون بە کەم خوێنی لە دایکی دووگیاندا.

**کاریگەری لاوەکی:**

هێڵنج ـ ڕشانەوە ـ سەرئێشە ـ گیراوی ـ ڕەشبوونی پیسایی ـ کەم بوونی ئارەزووی خواردن ـ تێکچوونی دەزگای هەرس.

**شێوەی دەرمان:** حەب ـ شرِوب ـ دڵۆپ.

**تێبینی:** خواردنەوەی چای یان قاوە هاوکات لەگەڵ ئەم دەرمانە دەبێتە هۆی کەمبوونی مژینی دەرمانە بۆ ناو خوێن.

# Fluconazol

# فلوكۆنازۆڵ

**ناوەكانی ترک:**

Diflocan, Flucoheal, Flucotifi, Infusiflux, Lib, Tififlux

**بەكارهێنان:**

بەكاردێت بۆ زۆرێک لە نەخۆشیەكان (هەوكردن) بەهۆی كەڕووەوە لەوانە:

هەوكردنی پەردەی مێشک بەهۆی كەڕووی (Cryptococcus neoformans)كە زۆرجار توشی هەوكردنی پێستمان دەكات.

هەوكردنی كۆئەندامی میز و میزەڕۆ.

هەوكردنی كۆئەندامی زاوزێی مێینە.

هەوكردنی ناو دەم و قورگ.

هەوكردنی پێست و قژ و نینۆكەكان.

**كاریگەری لاوەكی:**

سەرئێشە - هێڵنج - ڕشانەوە - پەڵە - ئازاری گەدە - ڕەوانی - ژەهراوی بوونی جگەر.

**شێوەی دەرمان:**

حەب - دەرزی - شرۆب.

**تێبینی:**

لەکاتی دووگیانی و شیرپێدان نابێت بەکاربێت.

# Fluoxetine

# فلۆکزیتین

**ناوی تر:**

Prozac

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەری خەمۆکی و خولیایی(واسواسی).

هەروەها بەکاردێت بۆ چارەسەری ئەو کەسانەی پەیوەست بوون بە ئەلکهول.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرئێشە ـ سەرگێژبوون ـ هیلاکی ـ بێخەوی ـ خەواڵوویی ـ خرۆشان ـ لەرزین ـ شێتی ـ ڕشانەوە و هێڵنجدان ـ وشکی دەم.

**شێوەی دەرمان:**

کەپسول ـ شرووب.

# Flurazepam

# فلورازیپام

**ناوەکانی ترک:**

Dalmane, Novoflupam

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی بێخەوی(خەوزڕان)

دەرمانێکی هێمن کەرەوەیە ، هەروەها بۆ ناتەواوی دەروونی، خەمۆکی، خەوێکی قوڵ بەکاردێت.

**کاریگەرک لاوەکی:**

سەرگێژبوون ـ بێهێزی و خەواڵوویی ـ لەبیرچوونەوە.

**شێوەی دەرمان:**

کەپسول.

**تێبینی:**

ئەم دەرمانە لە کاتی دووگیانی و شیرپێدان نابێت بەکاربێت.

نابێت بۆ تەمەنی خوار ١٥ ساڵ بەکاربێت.

# Folic Acid

# فۆلیک ئەسید

**ناوەکانی تر:**

Folicare, Folacin, Folvidone

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی کەم خوێنی، کەمی ئاسن ، بۆ نەخۆشی جگەر، لەکاتی دووگیانی دا بۆ هەست کردن بە لاوازی و بێ هێزی بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:**

هەستیاری پێست.

**شێوەی دەرمان:**

حەب - دەرزی.

# Furosemide

# فورۆزیماید

**ناوەکانی تر:**

Lasix, Furix, Impugan, Fumide, Luramide

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە تایبەتمەندیەتی میزهێنەری هەیە و دەبێتە هۆی زیاد میزکردن.

بەکاردێت بۆ حاڵەتی فریاکەوتن وەک ئاوبەندی کە ئاو دەچێتە ناو سییەکانەوە، بەکاردێت بۆ دابەزاندنی فشاری خوێن، ئاوساوی قاچ.

**کاریگەری لاوەکی:**

خورانی پێست - توانای بیستن کەم دەکاتەوە - لەدەستدانی مادده کانزاکانی نێو لەش.

**شێوەی دەرمان:**

حەب - دەرزی.

**تێبینی:**

لە کاتی دووگیانی و شیرپێدان نابێت بەکاربێت.




# Glimepiride

# گلامپیرِاید

**ناوەکانی تری:**

Amaryl, Glemax, Glorion

**بەکارهێنان:**

هانی دەردانی ئەنسۆلین دەدات لەخانەکانی بێتای پەنکریاس کاری وەرگرتنی خانەکان ئاسان دەکات لە کاتی وەرگرتنی ئەنسۆلین.

بە کاردیت بۆ چارەسەرکردنی بەرزبوونەوەی شەکرە خوێن جۆری دووەمی شەکرە.

**کاریگەری لاوەکی:**

هێڵنج و ڕشانەوە - سەرئێشە - ڕەوانی - سەرگێژبوون.

**شێوەی دەرمان:**

حەب.

# Gabapentin

# گابەپێنتن

**ناوەکانی ترک:**

Neurontin, Gabarone, Nurona, Gaptin

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ نەخۆشی فێ(صرع) بۆ ئازاری دەمارەکان وە کپ کردنیاین، ئازاری درێژ خایەنی پشت و جومگەکان، شەیقە.

**کاریگەرک لاوەکی:**

سەرگێژبوون - ماندویی - لەرزین - تا - کۆکە - زید بوونی کێشی لەش.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ کەپسول.

# Glibenclamide

# گلیبینکلامید

**ناوەکانی ترى:**
Daonil

**بەكارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی شەکرە لە جۆری دووەم، شەکرەی درۆزن کاتێک ڕێکخستنەوەی خۆراک، وەرزش وە دابەزاندنی کێش کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبووە.

**کاریگەری لاوەکی:**
هێڵنج - ڕشانەوە - لەرزینی دەستەکان.

**شێوەی دەرمان:**
حەب.

# Gentamycin
# جێنتەمایسین

**ناوەکانی تر:**

Garamycin

**بەکارهێنان:**

بەکاردیت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی کۆئەندامی میز و میزەرۆ، هەوکردنی کۆئەندامی هەرس وەکو پەنکریاس و جگەر و گەدە و ڕیخولە کۆیرە، هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە وەکو سییەکان، چارەسەرکردنی هەوکردن بە هۆی بەکتریاکان وەکو سیدۆمۆنەس، هەوکردنی میشک، هەوکردنی میزڵدان و هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ، هەوکردن بە هۆی بەکتریاکان دوای نەشتەرگەری، هەوکردنی ماسولکەکانی دڵ، هەوکردنی پیست و ئیسک و شانەکانی لەش، هەوکردنی جومگەکان، هەوکردنی چاو و گوێ و لووت.

**کاریگەری لاوەکی:**

هێڵنج و ڕشانەوە - خوران - نارێکی پەستانی خوێن - سووربوونەوەی پێست - ئاوسانی لەش - ژەهراوی بوونی گورچیلە.

**شێوەی دەرمان:** دەرزی - مەرهەم - دڵۆپ.

# Gemifloxacin

# جێمیفلۆکسیسن

**ناوەکانی ترک:**
Factive, Flobiotic

**بەکارهێنان:**
بەکاردێـت بـۆ چارەسـەرکردنی نەخۆشـی هەوکردنـی سییەکان، نەخۆشی درێژخایەنی

هەوکردنـی بۆرییەکـانی هەوا، هەوکردنـی ئالووەکـان، هەوکردنی کۆئەندامی میز و میزەڕۆ.

**کاریگەرک لاوەکی:**
ڕەوانـی - پەڵەی پێسـت - ڕشـانەوە - هیڵـنج - وشـک بوونی دەم - ئازاری سک - سەرگێژبوون.

**شێوەک دەرمان:** حەب.

ئاگاداربە!

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری.(C)

نابێت بەکاربێت لە لایەن دایکی شیردەر.

# Gatifloxacin

# گەیتیفلۆکسیسن

**ناوەکانی ترک:**

Tymer, Zymer

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی چاو بەهۆی بەکتریاکان، بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی پێڵوی چاو، هەوکردنی پەردەی چاو، هەوکردنی گلێنەی چاو.

**کاریگەری لاوەکی:**

ئازاری چاو - کزانەوەی چاو.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دڵۆپ.

# Guaifenesin + Dextromethrophan

# گایافێنزین + دیکسترۆمیسرۆفان

**ناوەکانی ترک:**

New Pectomed

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی کۆکە بەهۆی ڕووشانی قورگ و بۆڕی هەوا، ئازار بە هۆی کۆکەوە.

**کاریگەری لاوەکی:**

هێڵنج ـ ڕشانەوە ـ خەوالوویی ـ گێژبوون ـ سەرئێشە ـ هەستیاری پێست.

**شێوەی دەرمان:**

شروب.

# Guaifenesin

# گایافێنزین

**ناوەکانی ترک:**

Robitussin, Guiatuss

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ یارمەتی فڕێدانی بەڵغەم، کۆکەی تەر، هەوکردنی بۆڕی هەوا، سەرمای وەرزی.

**کاریگەری لاوەکی:**

تێکچوونی دەزگای هەرس.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شروب.

# Griseofulvin

# گریزۆفولڤین

**ناوەکانی تری:**

Fulvicin

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی پێست بە هۆی کەڕووەکان، هەروەها چارەسەرکردنی کەڕووی نینۆک و موو کە بە مەرهەم چارەسەر نەبن.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرئێشە ـ هێڵنج ـ ڕشانەوە ـ ژەهراوی بوونی گورچیلە ـ ئازاری سک ـ ماندوویەتی ـ هەستیاری.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شرِوب.

ئاگادابە!

نابێت بەکاربێت لە لایەن ئافرەتی دووگیان.

# Gemfibrozil

# جیمفیبرۆزیل

**ناوەکانی تری:**

Lopid

**بەکارهێنان:**

چارەسەرکردنی بەرزبوونەوە یان زۆری چەوری (کۆلیسترۆلی خوێن)، بەکاردێت بۆ نەهێشتنی بەرزی چەوری جگەر و لەش کە دروست ئەبێت بە هۆی زۆر وەرگرتنی گۆشت و بەرهەمە ڕۆنییەکان کە دەبێتە هۆی بەرزبونەوەی چەوری لە جۆری Triglyceride وە نابێت ئەم جۆرە چەورییە لە کەسی ئاساییدا زیاتر بێت لە ٢٠٠، وە ئەتوانرێت بە کاربێت وەکو خۆ پاراستن لە جەڵتەی دڵ و مێشک کە نایەڵێت چەوری بنیشێت لە ناو بۆریە کانی خوێن کە دبێتە هۆی سەکتە، دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی دروست بوونی چەوری جۆری VLDL لە جگەر.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەئێشە ـ سەرگێژبوون ـ ئازاری هەناو ـ ڕشانەوە ـ سکچوو ـ ئازاری ماسولکە.

**شێوەی دەرمان:**
کەپسول.

**تێبینی:**
نابێـت بەکاربێـت لە لایەن ئـافرەتی دووگیـان و دایکـی شیردەر.



# Haloperidol

## هالۆپێریدۆڵ

**ناوەکانی تری:**

Haldol, Haloprol, Peridol

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی دەروونی، تێکچوونی جەستەیی و دەروونی، ڕاڕایی، خەمۆکی، دڵەڕاوکێ، شیزۆفرینیا.

**کاریگەری لاوەکی:**

دابەزینی پەستانی خوێن - دڵەڕاوکێ - وشک بوونی دەم - هێڵنج - لاوازی جنسی.

**شێوەی دەرمان:**

حەب - دەرزی - شرۆب.

**تێبینی:**

لەکاتی دووگیانی و لە لایەن دایکی شیردەر نابێت بەکاربێت.

# Heparin

# هیپارین

**ناوەکانی ترک:**
Hepalean, Lioton Gel

**بەکارهێنان:**
بەکاردێـت بـۆ چارەسـەرکردنی تـۆپەڵ بـوونی خـوێن، چارەسەرکردنی خوێن مەیـن لە خـوێن هێـنەرە قووڵەکـان، ڕوون کردنەوەی خوێنی خەستی خوێن هێنەرەکـانی لەش، ناتەواوی سییەکان، بەکاردێت لە کاتی نەشـتەرگەری بۆ خـوێن نەمەیـین، بـۆ پاراسـتن لە جەڵـتە و گرژبـوونی بۆڕییەکانی خوێن هێنەرەکـان، پەسـتانی سـەر دەمارەکـان بە هۆی هێزێکەوە، چارەسـەرکردنی گیرانـی شـا خـوێنبەر، ناتەواوی مولوولەکانی خوێن.

**کاریگەری لاوەکی:**
خـــوێن بەربـــوون - کەم بـــوونی پەڕەکـــانی خـــوێن - درێژبـــوونەوەی کـــاتی مەینـــی خـــوێن - ســـووربوونەوەی پێست.

**شێوەی دەرمان:**
دەرزی - کرێم.

# Hydromorphene

# هایدرۆمۆرفین

**ناوی تر:**

Dilaudid

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی ئازاری کەم و مام ناوەندی لەش، ئازاری پەیکەرە ماسولکەکان، کپ کردنی کۆکە.

**کاریگەری لاوەکی:**

تێکچوونی ڕیخۆڵە و گەدە - خەواڵوویی - سەرگێژبوون.

**شێوەی دەرمان:**

حەب - دەرزی - شرۆب.

ئاگاداربە !

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری (D).

# Hyoscine

# هایۆسین

**ناوەکانی ترک:**
Buscopan

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە تایبەتمەندی دژە گرژبوونی هەیە، بەکاردێت بۆ هێورکردنەوەی ئازاری گرژبوونی ماسولکەکانی هەناو و ئازارەکانی کۆئەندامی زاوزێ.

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی گرژبوونی ڕیخۆڵەکان و میز و میزەڕۆ، هەروەها بەکاردێت بۆ کەمکردنەوەی نیشانەکانی نەخۆشی.(IBS)

**کاریگەرک لاوەکی:**
وشک بوونی دەم ـ دڵە کوتێ ـ سەرگێژبوون ـ سەرئێشە ـ هەستیاری پێست.

**شێوەک پێست:**
کەپسول ـ دەرزی.

# Hydroxyzine

# هایدرۆکسیزین

**ناوەکانی ترک:**

Atarax, Hyzine, Tikadag, Vistaril

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە جۆرێکە لە دژە هیستامین، بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی دڵەڕاوکێ، خەمۆکی، هێورکردنەوە، ڕشانەوە، خوران بەهۆی هەستیاری.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرگێژبوون - خەواڵوویی - سەرئێشە - هیلاکی - وشک بوونی دەم.

**شێوەی دەرمان:** حەب - دەرزی - شرۆب.

ئاگاداربە!

لە لایەن ئافرەتی دووگیان بە هیچ شێوەیەک نابێت بەکاربێت، لەبەر ئەوەی کاریگەری دەبێت لەسەر کۆرپەلە.

نابێت بەکاربێت لە لایەن دایکی شیردەر.

# Hydroquinone

## هایدرۆکوینۆن

**ناوەکانی ترک:**

Eldoquin, Eldopaque, Solaquin, Philaquin

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی لابردنی پەڵەی روخسار، سپی کردنەوەی ڕوخسار، لابردنی پەڵە بەهۆی میلانین و سکپری و حبی ڕێگری لە دووگیانی دروست دەبێت، زیپکەی دەم و چاو.

**کاریگەرک لاوەکی:**

هەوکردن ـ هەستیاری ـ وشک بوونی پێست.

**شێوەک دەرمان:** مەرهەم ـ گیراوە ـ جێڵ ـ سابون.

# Hydrocortisone

# هایدرۆکۆرتیزۆن

**ناوەکانی تری:**

Cetacort, Alfa-Cort, Hemol, Cortisone, Rectocort, Colifoam, Cortef

**بەکارهێنان:**

هایدرۆکۆرتیزۆن: هۆرمۆنێکە کە خۆی لە بنچینەدا لەش دروستی دەکات (کۆرتیزۆڵ) لە ڕژێنێکەوە (گلاند) کە دەکەوێتە سەر گورچیلەکانمان، لەکاتی ڕاڕایی و دوودڵی دا زۆر زیاتر دەیڕژێنێت وە ئەو کات چەندین کاریگەری لاوەکی دەبێت لەسەر تەواوی لاشەمان.

بەکاردێت بۆ هەستیاری پێست، هەوکردنی چاو، کۆئەندامی هەناسە، نەخۆشی تەنگە نەفەسی، ئەکزیما، خورانی کۆم، هەوکردنی ماسولکە.

**کاریگەری لاوەکی:**

داخورانی ئێسک - زیادبوونی شەکری خوێن - بەرزبوونی پەستانی چاو.

**شێوەی دەرمان:** حەب - شروب - مەلهەم.

# Hydrochlorothiazide

# هایدرۆکۆلۆرۆسایازاید

**ناوەکانی تر:**

Esidrex

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەهۆی زیادکردنی میزکردن و فراوانکردنی خوێنبەرەکان، دەبێتە هۆی دابەزاندنی پەستانی خوێن.

**کاریگەری لاوەکی:**

دابەزاندنی پەستانی خوێن ـ زیادبوونی رێژەی شەکر لە خوێن ـ بەرزبوونی رێژەی کۆلیسترۆڵ و ترای گلای سیرایدل خوێن ـ گێژبوون ـ لاوازی و سستی ـ سەرئێشە ـ هیلاکی.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

# Hydralazine

# هایدرالازین

**ناوەکانی ترک:**

Apresoline

**بەکارهێنان:**

بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی بەرزبونەوەی فشاری خوێن لە ئافرەتی دووگیان، بەکاردێت لە حاڵەتی فریاکەوتندا بۆ بەرزی فشاری خوێن، بەکاردێت بۆ نەخۆشی شکستی دڵ، سستی دڵ، هەروەها بەکاردێت بۆ نەخۆشی eclampsiaکە بریتیە لە بەرزبونەوەی بەرزی فشاری خوێن لە دایکی سکپڕ و بوونی پڕۆتینی زۆر لە میزدا وە ئەتوانرێت وەک خۆپاراستن بەکاربێت دژی دروست نەبوونی ئەو حاڵەتە.

**کاریگەرک لاوەکی:**

سەرئێشە ـ سەرگێژبوون ـ دڵە کوتێ ـ دابەزینی کتوپڕی پەستانی خوێن ـ هێڵنج و ڕشانەوە ـ گیرانی لووت ـ ناتەواوی بینین.

**شێوەک دەرمان:** حەب ـ دەرزی.

# Hematinic

# هیماتینیك

**ناوی تر:**
Autrin

**بەکارهێنان:**
بەکاردێـت بـۆ چارەســەری کەمخــوێنی بەهــۆی کەمــی ئاسن یان بەدخۆراکی لە کاتی سکپڕیدا .

**کاریگەری لاوەکی:**
هێلنج ـ ڕشـانەوە ـ گیـراوی ـ دڵە کـوتێ ـ سـووتانەوەی گەدە.

**شێوەی دەرمان:** کەپسول.

# Haloperidol

# هالۆپریدۆل

**ناوەکانی ترک:**

Haldol, Haloprol, Peridol

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی دەروونی (کتـووپڕ یان درێژخایەن).

تێـک چـوونی جەسـتەیی و دەروونـی، ڕاڕایـی، خەمـۆکی، دڵەڕاوکێ، شیزۆفرینیا.

**کاریگەری لاوەکی:**

سستی و بێهێزی ماسولکە ـ دابەزینی پەستانی خوێن ـ دڵەڕاوکێ ـ وشک بوونی دەم.

شێوەی دەرمان: حەب ـ دەرزی ـ شرۆب.

ئاگاداربە!

لە لایەن ئـافرەتی دووگیـان و دایکـی شـیردەر نابێـت بەکاربێت



Isoniazid

## ئایسۆنایزد

**ناوەکانی تری:**

INH, Isotamine

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی سیل، بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی بەکتریاکان.

**کاریگەری لاوەکی:**

تێکچوونی گەدە - نەخۆشی شەکرە - سەرگێژبوون - کەمی ئۆکسجین.

**شێوەی دەرمان:**

حەب - دەرزی - شرۆب.

**تێبینی:**

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری (C).

# Iron Dextran

# ئایرۆن دێکستران

**ناوەکانی ترک:**

jectofer, Proferdex, Sacrofer, Santafer

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی کەم بوونی ماددەی ئاسن لە لەشدا، بەکاردێت بۆ کەمی ئاسن لە ئافرەتی سکپڕ، کەم خوێنی بەهۆی کەمی ئاسنەوە، لاوازی و بێ تاقەتی، زیادکردنی پەڕەکانی خوێن.

**کاریگەری لاوەکی:**

هەستیاری - سەرگێژبوون.

**شێوەی دەرمان:**

حەب - دەرزی - شرووب.

**تێبینی:**

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری (C).

# Imipenem

# ئیمیپینەم

**ناوەکانی تری:**

Tienam, Primaxin

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی زۆربەی بەکتریاکان تایبەت لە منداڵدا، هەوکردنی کۆئەندامی میز و میزەڕۆ، هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە، هەوکردنی ئێسک و پێست و جومگەکان، هەوکردنی کۆئەندامی هەرس، هەوکردنی ماسولکەکانی دڵ.

**کاریگەری لاوەکی:**

تێکچوونی گەدە - کەم بوونی پەڕەکانی خوێن - گەشکە.

**شێوەی دەرمان:** دەرزی.

**تێبینی:**

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری.(C)

بۆ دایکی شیردەر نابێت.

# Imidapril

# ئیمیداپڕیل

**ناوەکانی تر:**

Tanatril

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن، سەکتەی دڵ، شکستی دڵ، ناتەواوی دڵ.

**کاریگەری لاوەکی:**

هێڵنج - سەرئێشە - کۆکە - سەرگێژبوون - ڕەوانی - ماندویی - نارێکی لێدانی دڵ - ئاوسان - سستی گورچیلە - بێ هۆشی.

**شێوەی دەرمان:**

حەب.

# Ibuprofen + Paracetamol

# ئایبوپڕۆفین + پاراسیتامۆڵ

**ناوەکانی تری:**

Megafen, Acetaprofen, Abusimol, Parofen

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی ئازاری کەم و مامناوەندی لەش، بەکاردێت بۆ تا، سەرئێشە، ددان ئێشە، ئازاری پەیکەرە ماسولکەکان، نەخۆشی ڕۆماتیزم، سەوەفان، بەکاردێت بۆ هەوکردنی ئێسک هەوکردنی جومگەکان.

**کاریگەری لاوەکی:**

هێڵنج - ڕشانەوە - بەدهەرسی - پەڵەی پێست - ناتەواوی گەدە و ڕیخۆڵە - سەرگێژبوون - بێخەوی .

**شێوەی دەرمان:** حەب - شرووب.

## Isosorbide Dinetrate

## ئازۆسۆربايد

**ناوەکانی ترک:**
Isordil, Iso-Bid, Sorbangil, Niglon

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە فراوانکەری بۆڕیەکانی خوێنە، بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی سنگە گوژێ ی توند و مام ناوەندی جێگیر و نا جێگیر، سەکتەی دڵ، نارێکی لێدانی دڵ.

**کاریگەرک لاوەکی:**
سەرئێشە ـ دابەزینی پەستانی خوێن ـ بورانەوە ـ خێرا لێدانی دڵ.

**شێوەک دەرمان:** حەبی ژێر زمان.

# Ipratropium bromide

# ئیپراترۆپیوم برۆماید

**ناوەکانی ترک:**
Itrop, Respontin, Atrovent

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە لە حاڵەتەکانی هەناسە توندی و گرژبوونی بۆڕیەکانی هەناسە بەهۆی گیرانی درێژخایەنی کۆئەندامی هەناسە بەکاردێت، هەروەها بۆ هەستیاری وەرزی و سەرمابوون و چارەسەری تەنگەنەفەسی.

**کاریگەرک لاوەکی:**
هێڵنجدان ـ وشک بوونی دەم ـ کۆکە ـ هەوکردنی لووت ـ سەرئێشە ـ سەرگێژبوون ـ هەوکردنی گەروو ـ پەڵە ـ تێکچوونی دەزگای هەرس.

**شێوەک دەرمان:** پرژێن(سپرای).

# Ipecac

# ئیپیکاك

**ناوەکانی تر:**
Ipeca, Oprec

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە تایبەتمەندی ڕشێنەرەوەی هەیە و دەبێتە هۆی ڕشانەوە.

بەکاردێت لەو کاتە کتوپڕانە کە کەسێک ژەهراوی بووە و پێویستە لە ڕێگەی ڕشانەوە مادده ژەهراویەکە فڕێبدرێتە دەرەوە.

**کاریگەری لاوەکی:**
سەرگێژبوون ـ خەوالّوویی ـ وشک بوونی دەم ـ لەرزینی دەست ـ خەمۆکی ـ نزم بوونەوەی پەستانی خوێن ـ سکچوو ـ گیراوی.

**شێوەی دەرمان:** شرۆب.

Indoquinol

**ئۆدۆكوینۆل**

**بەكارهێنان**:
ئەم دەرمانە بەكاردێت بۆ چارەسەری ئەمیبیای ڕیخۆڵە كە مشەخۆرێكی تاك خانەیی ڕیخۆڵەیە.

**كاریگەری لاوەكی**:
سەرئێشە ـ خوران ـ سووربوونەوە ـ سكچوو ـ ڕشانەوە.

**شێوەی دەرمان**: حەب.

Insulin

**ئەنسولین**

**بەكارهێنان**:
دەرمانێكی دژە نەخۆشی شەكرەیە(Antidiabetic)، لە چارەسەری نەخۆشەكانی شەكرە بەكاردێت.

**كاریگەری لاوەكی**:
دابەزینی شەكرەی خوێن.

**شێوەی دەرمان**: دەرزی.

**تێبینی:**
پێویستە ئەنسولین لە شوێنێکی سارد هەڵبگیرێت، بەڵام نابێت بیبەستێت.

Indomethacin

## ئیندۆمیساسین

**ناوەکانی تری:**
Indocid

**بەکارهێنان:**
بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی جومگەکان، هەوکردنی رۆماتیزم، بۆ ئازاری لەش و پەیکەرە ماسولکە، نەهێشتنی ئازاری سوڕی مانگانە، ئازاری ددان، ئازاری پشت، نەخۆشی شەقیقە، بۆ دژی هەوکردنی زیپکە، ئەتوانرێت بۆ تا بەکاربێت.

**کاریگەری لاوەکی:**
هێڵنج ـ ڕشانەوە ـ دڵە کوتێ ـ سەرئێشە ـ بەدهەرسی ـ خوێن بەربوون.

**شێوەی دەرمان:** کەپسول ـ دەرزی ـ شڕوب ـ شاف.

# Imipramine

# ئیمی پرامین

**ناوەکانی ترک:**
Tofranil, Novopramine, Toframine

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی خەمۆکی، میزکردن بەخۆدا لای منداڵ، ئازاری دەمار، هێورکەرەوە.

**کاریگەرک لاوەکی:**
وشک بوونی دەم ـ خەواڵوویی ـ دابەزینی پەستانی خوێن ـ هەڵوەرینی مووی سەر ـ هێڵنج و ڕشانەوە ـ خەم بوونی خڕۆکەی سپی خوێن.

**شێوەک دەرمان:** حەب.

# Ibuprofen

# ئایبوپرۆفین

**ناوەکانی ترک:**

Bruphen, Ibumax, Ibumetin, Ipren, Ifenin, Apifen, Neurofen, Pedea, Advil, Burana, Ibru, Xapril

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە تایبەتمەندی ئازار شکێنی هەیە، دژە تا و دژە هەوکردنە.

بەکاردێت بۆ چارەسەر و هێورکردنەوەی سووکە ئازار و ئازاری مامناوەند و دابەزاندنی تا.

**کاریگەری لاوەکی:**

دڵە کوتێ ـ هێڵنج ـ هیلاکی ـ سەرئێشە ـ سکچوو ـ کەم خەوی.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

ئاگاداربە !

لە سەرەتا و کۆتایی کاتی دووگیانیدا نابێت بەکاربێت



Kaolin–Pectin

## کەیلن - پێکتن

**ناوەکانی تری:**

Kapect, Pectocal

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی و توند و درێژخایەنی سکچوون لە منداڵدا.

هەوکردنی ناوسک و ڕیخۆڵەکان.

**کاریگەری لاوەکی:** گیراوی.

**شێوەی دەرمان:** شرۆب.

ئاگاداربە!

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری (C).

# Ketotifen OPH

# کیتۆتیفین ۆ پی ئێچ

**ناوی تر:**
zaditen

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمـانە بەکاردێـت بـۆ چارەسـەری هەسـتیاری و هەوکردنی وەرزی چاو.

**کاریگەری لاوەکی:**
هەوکردنی لووت ـ گەورەبوونی بیلبیلەی چاو ـ وشک بوونی دەم ـ سەرئێشە ـ خەوالّوویی ـ سووتانەوە ـ وشک بوونی چاو.

**شێوەی دەرمان:** دلۆپ.

# Ketotifen

# کیتۆتیفین

**ناوی تر:**

Zaditen

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمــانە دژی هەســتیاری و هەســتیاری وەرزی و هەوکردنــی لــووت و بــۆ پێشــگری لە نەخۆشــی هەناســە تەنگی(ڕەبۆ) بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:**

خەواڵوویی ـ وشک بوونی دەم ـ هێڵنج ـ سکچوو(ڕەوانی) ـ لەرزین ـ ئازاری جومگە،

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شرووب.

# Ketoconazole

# کیتۆکۆنازۆڵ

**ناوەکانی تری:**

Nizoral, Keozole, Extina, Fungoral

**بەکارهێنان:**

حەبی ئەم دەرمانە بۆ چارەسەری حاڵەتە توندەکانی هەوکردنی کەڕوو بەکاردێت،
هەروەها بەکاردێت لەکاتی هەوکردنی هەستیاری پێست، کەڕووی نێوان پەنجەکان و نینۆک، هەوکردنی کەڕوویی کۆئەندامی زاوزێی مێینە، هەوکردنی دژی بەکتریاکان، هەوکردنی کۆئەندامی هەرس.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرئێشە ـ سەرگێژبوون ـ ژەهراوی بوونی جگەر ـ هێلنج ـ کەمبوونی مووی سەر ـ ماندوویی ـ کپکردنی ڕژێنەکانی سەر گورچیلە.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ مەرهەم ـ شامپۆ.

ئاگاداربە!

ئەم دەرمانە توانای تێپەڕبوونی هەیە لەگەڵ شیری دایک وە ئەگەری هەیە کاریگەری خراپ بخاتە سەر کۆرپەلە.




# Leucovorin Calcium

## لیوکۆڤورین کالسیەم

**ناوەکانی تر:**

Leucovorin

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی کەم خوێنی، بێ تاقەتی، لاوازی ئافرەتی دووگیان، بەکاردێت بە درێژایی سکپڕی.

**کاریگەرک لاوەکی:**

هەستیاری - ڕشانەوە - ڕەوانی - هێڵنج - ماندویی.

**شێوەی دەرمان:**

حەب - دەرزی.

ئاگاداربە!

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری.(C)

نابێت بەکاربێت لە لایەن دایکی شیردەر.

# Lamvudine

# لامڤیودین

**ناوەکانی تر:**

Epivir, Heptovir

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی ڤایرۆسی HIV.

بەکاردێت لەگەڵ دەرمانی Zidovudine بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی ڤایرۆسی جگەر.

**کاریگەری لاوەکی:**

ڕەوانی - کەم خەوی - کەم خوێنی - ئازاری سک - ڕشانەوە - ئازاری ئێسک و ماسولکە - کۆکە - تێکچوونی هەرس.

**شێوە دەرمان:** حەب - گیراوە.

## Lisinopril + Hydrochlorothiazide

## لیسینۆپریڵ + هایدرۆکلۆرۆسازاید

**ناوەکانی ترک:**
Zestoretic, Lisoretic, Lisitens

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، نەخۆشی شۆکی دڵ، شکستی دڵ، سستی دڵ، میزپێ کردن کە دەبێتە هۆی دابەزینی پەستانی خوێن، چارەسەرکردنی سنگە کوژێی توند و درێژخایەن.

**کاریگەرک لاوەکی:**
میزپێکردن ـ ئازاری سنگ ـ سەرئێشە ـ ڕشانەوە ـ دەبەزینی پەستانی خوێن ـ هێڵنج ـ کۆکە ـ بەد هەرسی.

**شێوەک دەرمان:** حەب.

# Lovastatin

# لۆڤاستاتین

**ناوەکانی ترک:**

Advicor, Mevacor

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی بەرزبونەوە ی چەوری خوێن، کەم کردنەوەی کۆلیسترۆلیLDL ، کەم کردنەوەی چەوری ماسولکەکان.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرگێژبوون ـ سەرئێشە ـ سووربوونەوە ـ ئازاری سک ـ بێخەوی ـ بەد هەرسی ـ ڕەوانی و گیران.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

# Lorazepam

## لۆرازیپام

**ناوەکانی تری:**

Ativan

**بەکارهێنان:**

چارەسەرکردنی دڵە راوکێ، ترس، خەمۆکی بە کەمی، هێمن کردنەوە، خاوکردنەوەی ماسولکەکانی لەش، ئەتوانرێت بەکاربێت بۆ نەخۆشی گەشکە، چارەسەرکردنی ئەوانەی کێشەی خەویان هەیە(پێدانی خەوێکی درێژ).

**کاریگەری لاوەکی:**

گێژبوون ـ سەرسوڕان ـ هێمنکردنەوە ـ خەواڵوویی.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دەرزی ـ شروب.

**تێبینی:**

نابێت بەکاربێت لە کاتی دووگیانی.

## Lithium Carbonate

## لیسیۆم کاربۆنێیت

**ناوەکانی ترک:**
Eskalith, Lithonate, Lithobid, Carbolith

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە لە بواری دەروونیدا بەکاردەهێنرێت.

بەکاردێت لە حاڵەتی شێتی و خەمۆکی توند تێکچوونی دووجەمسەری و شیزۆفرینیا و بۆ ئەوانەی خویان بە ئەلکهولەوە گرتووە.

**کاریگەرک لاوەکی:**
هێڵنجدان ـ ڕشانەوە ـ ژانە سک ـ وشک بوونی دەم ـ ڕەوانی ـ نزم بوونەوەی پەستانی خوێن ـ سەرئێشە ـ هەستیاری.

**شێوەک دەرمان:** حەب ـ شرۆب.

# Lindane

## لينداين

<u>ناوەکانی ترک :</u>

kwell, Scabene, Jacutin, kwildane

<u>بەکارهێنان:</u>

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ چارەسەری پیس بوون بە ئەسپێ و گەڕی وە لە ناوبردنی هێلکەکانیان.

<u>کاریگەرک لاوەکی:</u>

هێڵنجدان ـ ڕشانەوە ـ زیاد لێدانی دڵ ـ ئازاری ماسولکە ـ سەرگێژبوون ـ تێکچوونی پێست.

<u>شێوەک دەرمان:</u>

شامپۆ ـ لۆشن.

# Lidocaine

# لیدۆکاین

**ناوی تر:**

Xylocaine

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە یەکێکە لە دەرمانە سڕکەرەکان، دەرزی لیدۆکاین بۆ سڕکردن لە کاتی نەشتەرگەری بەکاردێت.

مەرهەمی لیدۆکاین بۆ سڕکردنی پێست لە سووتانەوە بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:**

هێڵنداان ـ ڕشانەوە ـ کەمبوونەوەی لێدانی دڵ ـ نەمانی ئارەزووی خواردن ـ نزم بوونەوەی پەستانی خوێن.

**شێوەی دەرمان:**

مەرهەم ـ جێڵ ـ دەرزی.

# Levothyroxine

# لیڤۆسایرۆکسین

**ناوەکانی تر:**

Thyroxine, Eltroxin, Levaxin

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ غودەی ڕژێنی دەرەقی(سایرۆید گلاند)، کەمبوونی پایرۆکسین، هاندانی هۆرمۆنی پایرۆکسین.

**کاریگەری لاوەکی:**

توورەیی ـ دڵە کوتێ ـ بێ خەوی ـ لەرزینی دەستەکان ـ ئارەقە کردن ـ تا ـ ڕەوانی ـ هێڵنج.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دەرزی.



Maprotiline Hcl

## ماپرۆتیلاین هیچ سی ئێل

**ناوەکانی تر:**

Lodium, Ludiomil

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی خەمۆکی، دڵەڕاوکێ، ترس، میز بە خودا کردن لە کاتی خەوتندا، پەستانی دەروونی.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرئێشە - وشک بوونی دەم - هەستیاری پێست - بێخەوی - خێرا لێدانی دڵ - ناتەواوی لە ئاخاوتن.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

# Meclizine

# مێکلایزن

**ناوەکانی ترک:**
Dramamine, Antivert, Navoproxen

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی ڕشانەوە(بەتایبەت بەهۆی گەشتکردنەوە)، هێڵنج، گێژبوون، ڕشانەوەی ئافرەتی دووگیان.

**کاریگەرک لاوەکی:**
خەواڵوویی ـ لێڵ بینین ـ گەورەبوونی دیواری هەناسە.

**شێوەک دەرمان:** حەب.

**تێبینی:**
توانای تێپەڕبوونی هەیە لەگەڵ شیری دایک بۆیە نابێت بەکاربێت لە لایەن دایکی شیردەر.

# Mafenide acetate

# مافیناید ئەسیتێت

**ناوی تر:**
Sulfamylon

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەری هەوکردنی برین و سووتانی پلە یەک و دوو، هەروەها بەکاردێت بۆ پێشگرتن و چارەسەری هەوکردن بەهۆی بەکتریای(سیدیۆمۆنەس ئایرۆجینۆسا).

**کاریگەری لاوەکی:**
سووتانەوەی شوێنی بەکارهێنان ـ سووربوونەوەی پێست ـ ئازار.

**شێوەی دەرمان:** مەرهەم.

# Mebendazole

# میبێندازۆڵ

**ناوەکانی ترک:**

Vermox, Vermin

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی کرمە قولاپەکان، کرمە خڕەکان، کرمە پانەکان، بۆکرمی گوریسی، بەکاردێت بۆ کرمە دەزوولیەکان - کرمی ئەسکارس، کرمی شریتی، کرمی رەشە وولاخ و بەراز.

**کاریگەری لاوەکی:**

ئازاری سک ـ هێڵنج و ڕشانەوە ـ بای سک ـ لیرک.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شڕوب.

# Medroxyprogestrone

# مێدرۆکسی پرۆجیسترۆن

**ناوەکانی ترک:**

Depo-provera

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ ڕێگرتن لە دووگیان بوون، ناتەواوی خوێن بەربونی منداڵدان، ریگەگرتن لە پیتاندنی هێلکە.

**کاریگەرک لاوەکی:**

ڕووشانی گەدە و ڕیخۆڵە ـ ڕشانەوە ـ هیڵنج.

**شێوەک دەرمان:**

حەب ـ دەرزی.

ئاگاداربە!

پۆلێن دەکرێت بۆ جۆری(X)

لە ئافرەتی دووگیان و دایکی شیردەر نابێت بەکاربێت.

# Mefenamic Acid

# ترشی میفینامیك

**ناوەکانی تر:**
Ponstan

بەکارهێنان:

چارەسەرکردنی ئازاری توند و مام ناوەندی لەش، ئازار و هەوکردنی ددان، ئازاری سوڕی مانگانە لە ئافرەتان، ئازاری پەیکەرە ماسولکە، ئەتوانرێت بۆ سەرئێشە بەکاربێت، ئازاری پشت و جومگەکان و هەوکردنی ڕۆماتیزمی.

**کاریگەری لاوەکی:**
هێڵنج و ڕشانەوە ـ ڕەوانی ـ خوێن بەربوون لە کۆئەندامی هەرس ـ کەم خەوی ـ پەڵەی پێست ـ ئازاری سک ـ کەم بوونی کێشی لەش.

**شێوەی دەرمان:** حەب ـ شرۆب.

ئاگاداربە!

نابێت بەکاربێت لە کاتی دووگیانی زیانی هەیە بۆ کۆرپەلە.

## Menthol + Eucalyptol

## مێنسۆڵ سالیسیلێیت

**ناوەکانی ترک:**

Arthric - Flex

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ هێورکردنەوە و چارەسەرکردنی ئازار و گرژبوونی ماسولکە، بۆ ئازاری بەستەر و جومگەکان و مل و پشت و ئەژنۆ.

**کاریگەری لاوەکی:**

هەستیاری - ڕووشان.

**شێوەی دەرمان:** مەرهەم - دەرزی.

# Metformin

# میتفۆرمین

**ناوەکانی تری:**

Glucophage , Glucophage XR

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ نەخۆشی شەکرە لەجۆری ٢ بەتایبەتی ئەوانەی کێشیان زۆرە.

**کاریگەری لاوەکی:**

کەم بوونی ئارەزووی خواردن ـ هێڵنج ـ ئازاری سک ـ ڕەوانی ـ هەستیاری پێست.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

**تێبینی:**

ئەگەر بۆ ماوەیەکی درێژ ئەم دەرمانە بەکاربێت دەبێتە هۆی کەم بوونی ڤیتامینB) ١٢)، بۆیە پێویستە لەگەڵی ڤیتامینB) ١٢ (وەربگرێت.

# Methocarbamol

# میسۆکارباموڵ

**ناوی تر:**
Robaxin

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ خاوکردنەوەی پەیکەرە ماسولکە، هەروەها بەکاردێت بۆ هێورکردنەوەی ئێشە تیژەکانی ماسولکە.

**کاریگەری لاوەکی:**
هەستیاری ـ خەواڵوویی ـ سەرگێژبوون.

**شێوەی دەرمان:**
حەب ـ دەرزی.

# Methyldopa

## مێسیل دۆپا

**ناوەکانی ترک:**

Aldomet, Alfadopa, Epidopa

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی ئەو کەسانەی پەستانی خوێنیان بەرزە، هەروەها بەرزبونەوەی پەستانی خوێن لە ئافرەتی دووگیاندا. ناتەواوی گورچیلە، ناڕیکی لێدانی دڵ، سەکتەی دڵ.

**کاریگەرک لاوەکی:**

سەرگێژبوون ـ وشک بوونی دەم ـ خەواڵوویی ـ تا ـ ئاوسان ـ کەم خوێنی ـ بێ ڕەنگی میز.

**شێوەک دەرمان:**

حەب ـ دەرزی.

# Metoclopramid

## میتۆکلۆپرامايد

**ناوەکانی تری:**

Plasil, Primperam, Metamid, Meclopram

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ قەدەغەکردنی ڕشانەوە و هێڵنج، بۆ خراپ هەرس کردن، نەخۆشی (GERD) گەڕانەوەی ترشی گەدە بو سورینچک، بەکاردێت لەکاتی بەکارهێنانی تیشک بۆ کۆئەندامی هەرس، کەمکردنەوەی ئازاری گەدە.

**کاریگەری لاوەکی:**

کاریگەری هەیە لەسەر کۆئەندامی دەمار - دڵە ڕاوکێ - گێژبوون - نائارامی - ڕەوانی - خەمۆکی.

**شێوە دەرمان:**

حەب - دەرزی - شرۆب - دڵۆپ.

ئاگاداربە!

بۆ دایکی شیردەر نابێت بەکاربێت.

# Metronidazole

## مترۆنایدازۆڵ

**ناوەکانی ترک:**

Flagyl, Metrogel, Neogel, Negazole, Metrogel Vaginal, Nidazole, Flagyraz

**بەکارهێنان:**

بەکاردیت بۆلەناو بردنی ئەمیبای جگەر، بۆ سک چوون بەهۆی بوونی بەکتریای پرۆتۆزوا، هەوکردنی قۆڵۆن، بۆ هەوکردنی ددان، هەوکردنی ماسولکەکانی دڵ، بۆ پشت، جومگە، ئێسک، هەوکردنی پەردەی ناوەوەی مندالدان و بۆری فالوب، هەوکردنی سییەکان، ژەهراوی بوونی خوێن، سوتانەوەی گەدە و برینی گەدە و دوانزەگرێ، هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێی ئافرەتان، بۆ چارەسەرکردن لە دوای نەشتەرگەری، نەخوشی-H pylori.

**کاریگەرک لاوەکی:**

هەستیاری - تێکچوونی پێست - سەرگێژبوون - تێکچوونی گەدە - سەرئێشە.

**شێوەک دەرمان:**

حەب ـ شڕوب ـ دەرزی ـ مەرهەم ـ جێڵ.

تێبینی:
نابێت بەکاربێت لە لایەن دایکی شیردەر.

# Miconazole

# میکۆنازۆل

**ناوەکانی تری:**
Monicure-Plus

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردن بە هۆی کەڕوو، چارەسەرکردنی هەوکردن کۆئەندامی زاوزێ بەهۆی کەڕوو.

**کاریگەری لاوەکی:**
خوران ـ سووتانەوە ـ ڕشانەوە ـ هیلنج ـ ڕەوانی ـ سووربوونەوەی پێست.

**شێوەی دەرمان:** مەرهەم.

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێن دەکرێت بۆ جۆری(C).

# Minoxidil

# مینۆکسیدیل

**ناوەکانی تر:**

Recrea, Rogaine, Neoxidil, Regaine, Revexan, Loniten

**بەکارهێنان:**

وەک حەب: بەکاردێت بۆ بەرزی پەستانی خوێن بۆ کەسێک کە بەتەنها جۆرەکانی تری دابەزێنەری پەستانی خوێن کاریگەری کەمە.

وەک سپرای قژ(٥٠ملگم/ملل تەنها بۆ پیاوانە): بەکاردێت بۆ وەستاندنی وەرینی مووی سەر هەروەها بۆ زیادبوونی قژ.

**کاریگەری لاوەکی:**

خوران ـ تێکچوونی پێست ـ خێرا لێدانی دڵ ـ گۆڕانی ڕەنگی قژ.

**شێوەی دەرمان:** حەب ـ پرژێن(سپرا).

تێبینی: نابێت بەکاربێت بۆ ئافرەتی دووگیان و دایکی شیردەر.

# Multivitamin

# مۆلتی ڤیتامین

**ناوەکانی تر:**

Cenvit, Elvadon, Glovit, Neovita, Centrum, Vitiron, Vitaglobin, Vitarex, Materna, Pharmaton.

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ زیادکردنی ڤیتامینەکان لەلەشدا، بۆ بێ هێزی و لاوازی لەش، کەم خوێنی، جوانکردنی پێست، لاوازی ئێسک، نەخۆشی زەردووی، بوژانەوەی لەش.

**کاریگەری لاوەکی:**

ڕەوانی ـ هێڵنج ـ ڕشانەوە.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شرووب ـ دڵۆپ.



Nortriptyline

## نۆرتریپتایلین

**ناوەکانی تر:**

Sensaval, Aventyl, Noritren

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی خەمۆکی درێژخایان.

**کاریگەرک لاوەکی:**

خەوالّوویی ـ تێکچوونی بینین ـ لەرزین ـ سەرگێژبوون ـ خێرا لێدانی دلّ ـ دابەزینی پەستانی خوێن ـ ئارەقە کردن.

**شێوەی دەرمان:** حەب ـ دەرزی.

ئاگاداربە!

بۆ ژێر ١٨ سال بەکارنایەت.

بۆ ئافرەتی دووگیان نابێت بەکاربێت.

# Nitroglycerin

# نایترۆگلایسیرین

**ناوەکانی ترک:**

Glytrin, Minitran, Nitrogard, Nitrospan, Angised, Nitrolingual.

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە فراوانکەری بۆڕیەکانی خوێنە، وە بۆ خۆپاراستن لە سنگەکوژە (Angia pectoris)بەکاردێت.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرئێشە - دابەزینی پەستانی خوێن - سەرگێژبوون - هێلنجدان.

**شێوەی دەرمان:**

حەب - دەرزی - پرژێن(سپرای).

# Nitrofurantoin

## نایترۆفورانتۆین

**ناوەکانی تری:**

Furadantin, Niftran, Macrobid, Furabid, Niftran, Nitr Macro.

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمــانە دژە بەکتریــایە بە کاردێــت لە هەوکردنــی ڕێڕەوی میز و هەوکردنی گورچیلە.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرئێشە ـ هەستیاری ـ خوران ـ دڵ تێکەڵهاتن ـ ئازاری ماسولکە ـ تا.

**شێوەی دەرمان:** حەب ـ شرۆب.

ئاگاداربە !

نابێت لە لایەن دایکی شیردەر بەکاربێت تایبەت ئەگەر کۆرپەلەکەی بچووکتر بوو لە ١ مانگ.

# Nifedipine

# نیفیدیپین

**ناوەکانی تری:**
Adalat, Epilat, Nifepin.

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی بەرزبونەوەی پەستانی خوێن، سنگەکوژێ ی جێگیر و نا جێگیر، رەبۆ، ئازاری لەش، گرژبوونی ماسولکەکانی دڵ.

**کاریگەری لاوەکی:**
سەرگێژبوون ـ دابەزینی لەناکاوی پەستانی خوێن ـ سەرئێشە ـ سووربوونەوە.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێن دەکرێت بۆ جۆری (C).

# Naphazoline + Antazoline

## نافازۆلین + ئەنتازۆلین

**ناوەکانی ترک:**
Rinovin, Ophtazoline, Vasocon–A

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی لووت بەهۆی هەستیار، بەکاردێت بۆ تای بەرز، بەکاردێت بۆ گیرانی لووت، بەکاردێت بۆ هەوکردنی پێڵووی چاو، تێکچوونی پێڵووی چاو، هەستیاری چاو و پەردەی چاو.

**کاریگەری لاوەکی:**
ڕووشاندنی چاو - بەرزبوونەوەی پەستانی ناوەوەی چاو.

**شێوەی دەرمان:** دڵۆپ.

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری (C).

# Naproxen

# ناپرۆکسین

**ناوەکانی تر:**
Naprosyn, Inaprol, Pronaxen, Alpoxen

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە بەکاردێت لە کاتی سوکە ئازار یان ئازارە توندەکانی ماسولکە،

هەروەها بەکاردێت لەکاتی هەوکردنی جومگە و ئێسک، بۆ ئازار، ڕۆماتیزم، ئازاری سوڕی مانگانە، ئازاری ددان، تا.

**کاریگەری لاوەکی:**
سەرئێشە ـ هێڵنج ـ ڕشانەوە ـ خوێن بەربوونی کۆئەندامی هەرس ـ هەناسە تەنگی ـ تێکچوونی خەو ـ وشک بوونی دەم.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

ئاگاداربە!

نابێت ئەم دەرمانە بەکاربێت لە ٣ مانگی کۆتایی دووگیانی.

# Nalidixic Acid

## ترشی نالیدیکسیك

**ناوەکانی ترک:**
Nigram

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی بەشی خوارەوەی کۆئەندامی میز و میزەڕۆ، بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی دژی بەکتریاکان وەکو باسیلەس، چارەسەرکردنی سکچوون، هەوکردنی میزڵدان.

**کاریگەری لاوەکی:**
هێڵنج ـ ڕشانەوە ـ ڕەوانی ـ ئازاری سک ـ سەرئێشە ـ سەرگێژبوون ـ ناتەواوی بینین ـ خەواڵوویی.

شێوەی دەرمان: حەب ـ شرۆب.



Olopatadine

ئۆلۆپاتدین

**ناوەکانی تر:**

Opatanol, Olopat

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەستیاری چاو، بەکاردێت بۆ خرۆشتنی پێڵوی چاو.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرئێشە - لێڵ بینین - وشکی چاو - هیلاکی - سووتانەوە.

**شێوەی دەرمان:** دڵۆپ.

لەکاتی دووگیانی و لە لایەن دایکی شیردەر نابێت بەکاربێت.

# Oxaprozin

## ئۆکسیپرۆزین

**ناوەکانی ترک:**
Daypro

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی جومگەکان، ئێسک، هەوکردنی ڕۆماتیزم، نەهێشتنی ئازاری توند و بەهێزی لەش، تا، نەخۆشی پاشاکان، ئازاری ددان.

**کاریگەری لاوەکی:**
ناتەواوی نوستن - پەڵەی پێست - تێکچوونی گەدە و ڕیخۆڵە - سستی گورچیلە.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

# Orphenadrine

# ئۆرفینادرین

**ناوەکانی تر:**

Norflex, Orphenate

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی ئازاری پەیکەرە ماسولکە، ئازاری پشت، مل، سەر،خاوکردنەوەی پەیکەرە ماسولکەکان، چارەسەرکردنی گرژبوونی ماسولکەکان.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرگێژبوون ـ ماندوویی ـ وشک بوونی دەم ـ لێڵ بینین.

**شێوەی دەرمان:** حەب ـ دەرزی.

ئاگاداربە!

لە لایەن دایکی شیردەر نابێت بەکاربێت.

# Ondansetron

## ئۆندانسترۆن

**ناوەکانی ترک:**
Zofran

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ کەم کردنەوەی ڕشانەوە و هێڵنج لەکاتی چارەسەری کیمیاوی.

**کاریگەرک لاوەکی:**
سەرئێشە ـ نەزگرە ـ ڕەوانی ـ گیران.

**شێوەک دەرمان:** حەب ـ دەرزی.

ئاگاداربە!

لا لایەن دایکی شیردەر نابێت بەکاربێت.

# Omeprazole

# ئۆميپرازۆڵ

**ناوەكانی تر:**

Losec, Gasec, Aprazole, Risek, Epirazole, Omecat.

**بەكارهێنان:**

بەكاردێت بۆ چارەسەری برینی گەدە، برینی دوانزە گرێ، وە بۆ گەرانەوەی ترشێتی گەدە بۆ سورێنچك(GERD)، دڵە كزێ.

**كاریگەری لاوەكی:**

سەرئێشە ـ سەرگێژبوون ـ هێڵنج ـ ڕشانەوە ـ ڕەوانی.

**شێوەی دەرمان:** حەب ـ دەرزی.

# Oxazepam

# ئۆکسازیپام

**ناوەکانی ترک:**

Serax, Zapex, Sobril, Oxascand, Alopam, Serepax.

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی دڵەراوکێ، نا ئارامی، نەخۆشی دەروونی، ئارام کردنەوە، وازهێنان لە کحول.

**کاریگەرک لاوەکی:**

خەواڵوویی ـ سەرگێژبوون ـ پەڵەی پێست.

**شێوەک دەرمان:**

حەب.




## Phenylephrine

## فنیلیفرین

**ناوەکانی تر:** Nasophrin, Mydfrin, Rhinall

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەهێشتنی گیرانی لووت، بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی سەرمای وەرزی و هەلامەت، بەکاردێت بۆ هەستیاری کۆئەندامی هەناسە، بۆ چارەسەرکردنی سستی سکۆلەکان، سەکتەی دڵ، نەخۆشی انفلۆنزا، هەوکردنی ئاڵووەکان، نەخۆشی گلوکۆمای چاو، گەورەکردنی بیلبیلەی چاو.

**کاریگەری لاوەکی:**

سووتانەوە - بژمین - ڕشانەوە - لاوازی - کەم بوونی ئارەزووی خواردن - نائارامی - ئارەقەکردن.

**شێوەی دەرمان:** حەب - دەرزی - دڵۆپ.

ئاگاداربە!

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری.(C)

بۆ دایکی شیردەر نابێت.

# Phenobarbital

# فینۆباربیتاڵ

**ناوەکانی ترک :**
Luminal, Sominaletta

**بەکارهێنان:**
بەکار دێت بۆ چارەسەرکردنی دڵەڕاوکێ، گەشکە، بێ خەوی، چارەسەرکردنی گرژ بوونی ماسولکەکان و خاوکردنەوەی، بەکاردیت بۆ هێمن کەرەوە لە کاتی نائارامی، ناتەواوی کرداری هەرس.

**کاریگەری لاوەکی:**
سەرگێژبوون ـ خەواڵوویی ـ خاو بوونەوەی لێدانی دڵ ـ دابەزینی پەستانی خوێن.

**شێوەی دەرمان:** حەب ـ شرۆب ـ دەرزی.

ئاگاداربە!

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری.(D)

# Phenazopyridine

## فینازووپایریدین

**ناوەکانی ترک:**

Pyridium, Urodine, Phenazodine

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی هەوکردنی کۆئەندامی میزو و میزەڕۆ، سڕکردنی کۆئەندامی میز، چارەسەرکردنی ڕووشاندنی بەشی خوارەوە کۆئەندامی میزو و میزەڕۆ، بەکاردێت بۆ نەهێشتنی ئازار، سووتانەوە و هەوکردنی هۆڕی میز و کزانەوەی.

**کاریگەرک لاوەکی:**

سەرئێشە - تێکچوونی کۆئەندامی هەرس - سەرگێژبوون - سستی گورچیلە.

**شێوەک دەرمان:** حەب.

**تێبینی:**

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری.(B)

# Perisca

# پریسکا

**بەكارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەكاردێت بۆ لابردنی ڕەنگ و پەڵە لەسەر ددانەكان، هەروەها بۆ ڕێگری لە ڕزین و كلۆربونی ددانەكان، وە دەم خاوێن ڕادەگرێت، هەروەها وەك هێوركەرەوە بۆ ئازاری ددان بەكاردێت.

**شێوەی دەرمان:**

دەرمانێكە لە سەرچاوە ڕووەكی بەرهەم دێت و بە شێوەی دڵۆپ لە دەرمانخانەكان دەست دەكەوێت.

# Penicillin - V

# پەنسیلین - ڤی

**ناوەکانی ترک :**

Ospen, Penicillin-V

**بەکارهێنان:**

بەکاردێـت بـۆ چارەسـەرکردنی هەوکردنـی قـورگ، هەوکردنـی ئاڵووەکـان، هەوکردنـی گـوێی ناوەراسـت، هەوکردنـی سـنگ و سـییەکان، چارەسـەرکردنی تـای رۆمـاتیزمی، هەوکردنـی کۆئەنـدامی هەناسـە بە هـۆی بەکتریـای +Gو -G -- هەوکردنـی لـووت و گـوێ، هەوکردنـی سورێنچک، هەوکردنـی جیـوب ( سـوێیەکان )، هەوکردنـی بۆڕی هەوا، هەوکردنـی ماسولکەکانی دڵ، هەوکردنی جومگەکان، هەوکردنی مێشک.

**کاریگەرک لاوەکی:**

هێڵنج ـ ڕەوانی ـ هەستیاری ـ سووربوونەوە ـ تا ـ ئـازاری ئێسک.

**شێوەک دەرمان:**

حەب ـ شرۆب.

# Penicillin G

# پەنسیلین جی

**ناوەکانی تری:**

Bicillin, Retarpen, Pencitard, Penadur

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکرنی هەوکردنی قورگ و لەوزەتێن و سییەکان، هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە، هەوکردنی کۆئەندامی میزو و میزەڕۆ، نەخۆشی فەرهەنگی دەمارەکان، نەخۆشی رۆماتیزم، هەوکردنی بۆری هەوا، هەوکردن و ئازاری ئێسک و شانەکان.

**کاریگەری لاوەکی:**

هەستیاری - بوورانەوە - ئازاری گورچیلە.

**شێوەی دەرمان:** دەرزی.

# Pediatric Grip

# پیدیاتریک گریپ

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ هێورکردنەوەی نیشانەکانی پەسیوی منداڵان، گیرانی لووت و ئاو بە لووتا هاتنەخوارەوە.

**کاریگەری لاوەکی:** خەواڵوویی.

**شێوەی دەرمان:** شرووب.

# Pancreatin + Sodium Hydrochlorate + Cellulas

# پەنکریاتین + سۆدیۆم هایدرۆکلۆرەیت + سێلولەس

**ناوەکانی ترک:**

Spasmocholonase

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی کۆئەندامی هەرس، بای سک، ڕەوانی، کەمکردنەوەی رووشاندنی کۆلۆن، گرژبوونی گەدە و ریخۆلەکان، سکچون، بەد هەرسی، قەبزی، هێلنج، غازاتی ریخولەکان.

**کاریگەری لاوەکی:**

وشک بوونی دەم - لێل بینین - خێرابوونی لێدانی دل - نارەحەتی لە میزکردن.

**شێوەی دەرمان:** حەب.



Ribavirin

## ڕایباڤایرین

**ناوەکانی ترک:**

Virazole, Virokan, Virin, Copegus, Rebetol, Moderiba

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە لە منداڵدا، لەگەڵ ئەلفا بەکاردێت بو هەوکردنی جگەر جۆری.(HCV)

**کاریگەرک لاوەکی:**

سەرئێشە ـ ماندوویی ـ تێکچوونی گەدە ـ قژ ڕووتانەوە ـ هەوکردنی پێست ـ ئازاری ئێسک و ماسولکە ـ خەمۆکی ـ کۆکە ـ هێلنج ـ ڕەوانی ـ تا.

**شێوەک دەرمان:** حەب ـ دەرزی ـ مەرهەم ـ گیراوە.

ئاگاداربە !

لە کاتی دووگیانی و لە لایەن دایکی شیردەر نابێت بە هیچ شێوەیەک بەکاربێت.

# Ranolazine

# ڕانۆلازین

**ناوەکانی تر:**
Ranexa

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی سنگە کوژێی درێژ خایەن، ناتەواوی دڵ، بەکاردێت بۆ نارێکی لێدانی دڵ.

**کاریگەری لاوەکی:**
سەرئێشە - سەرگێژبوون - نارێکی لێدانی دڵ - گیران(قەبزی).

**شێوەی دەرمان:** حەب.

ئاگاداربە!

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری.(C)

بۆ دایکی شیردەر نابێت بەکاربێت.

# Ranitidine

## رانیتیدین

**ناوەکانی ترک:**
Zantac, Histac, Glotac, Inside, Rani-Q, Xinar

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە تایبەتماندی دژە ترشیەتی هەیە، بەکاردێت بـۆ چارەسـەری برینـی گەدە، برینـی دوانـزە گـرێ، وە بـۆ گەرانەوەی ترشـێتی گەدە بـۆ سـورێنچک(GERD)، دڵە کزێ.

**کاریگەرک لاوەکی:**
سەرئێشە ـ سەرگێژبوون ـ هیلاکی ـ هێلنج ـ سک ئێشە ـ ڕەوانی ـ گیران.

**شێوەک دەرمان:** حەب ـ شرپوب.

# S

## Silver Sulfadiazine

## سیلڤێر سەڵفادایازین

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ خۆپاراستن و چارەسەری هەوکردنی سووتانی پێست.

**کاریگەری لاوەکی:**

چوزانەوە و خوران.

**شێوەی دەرمان:**

مەرهەم.

## Selenium sulfide

## سێلینیۆم سەلفاید

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ چارەسەر و لابردنی تۆشکەی سەر.

**کاریگەری لاوەکی:**

ڕووتانەوەی قژ ـ تێکچوونی پێست.

**شێوەی دەرمان:** شامپۆ.

# Sankol

## سانکۆل

**بەکارهێنان:**
ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ فرێدانی بەرد لە بۆڕیەکانی کۆئەندامی میز، هێورکردنەوەی ئازاری گورچیلە و هەوکردنی بۆڕیەکانی میز بەکاردەهێندرێت .

**کاریگەری لاوەکی:**
لە دەستدانی ئەلبۆمین، لە دەست دانی ئاو کانزاکانی لەش، دروست بوونی خوێن لەگەڵ میز.

**شێوەی دەرمان:** دڵۆپ.

# Salbutamol

## سالبیوتامۆل

**ناوەکانی ترک:**
Ventolin

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی رەبۆ، چارەسەرکردنی تەنگەنەفەسی (گران هەناسەدان)، هەوکردنی کەم و درێژخایەنی بۆری هەوا، چارەسەرکردنی گرژبوون و تەسکبوونەوەی بۆڕی هەوا، هەوکردنی سییەکان.

**کاریگەرک لاوەکی:**
دڵە کوتێ ـ سەرگێژبوون ـ لەرزینی دەست ـ هێڵنج و ڕشانەوە ـ ئازاری سک ـ خێرا لێدانی دڵ ـ کۆکە ـ پژمین ـ کەم بوونی ڕێژەی پۆتاسیۆم.

**شێوەک دەرمان:**
حەب ـ شرۆب ـ گیراوە ـ بەخاخ.



Tamsulosin

## تەمسیلسن

**ناوەکانی ترک:**

Flomax, Urimax, Tamsulin

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی پرۆستات، هەوکردنی خوارەوەی کۆئەندامی میز، گەورەبوونی خانەکانی پرۆستات، سووتانەوەی میزەڵدان و بۆڕی میز.

**کاریگەرک لاوەکی:**

سەرئێشە - سەرگێژبوون - بورانەوە - کەم خەوی.

**شێوەک دەرمان:** کەپسول.

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێن دەکریَ بۆ جۆری.

# Tretinoin

## تریتینۆین

**ناوەکانی ترک:**
Retin–A, Smooderm, Tretin-x

**بەکارهێنان:**
بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی زیپکەی ڕووخسار و لۆچی ڕووخسار، لابردنی خانەی مردووی سەرپێست، لابردنی چینی کیراتینی پێست، وردە بالوکەی پێست، گۆڕانی ڕەنگی پێست، بەکاردێت بۆ پاراستنی پێست لە تیشکی خۆر، نەخۆشی سۆریاسز.

**کاریگەرک لاوەکی:**
وشک بوونی پێست - سووتانەوەی پێست - سووربوونەوەی پێست .

**شێوەک دەرمان:**
کەپسول - مەرهەم - جێڵ - گیراوە.

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری.(C)

# Trimethoprim

# ترایمیسۆپرین

**ناوەکانی ترک:**

Sulfamexazole, Bactrim, C-trim, Septriam, Metheprim, Idotrim

**بەکارهێنان:**

بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی کۆئەندامی میز و میزەڕۆ، بۆ ڕێگری لێکردنی هەوکردنی کۆئەندامی میز و میزەڕۆ.

**کاریگەرک لاوەکی:**

هێڵنجدان ـ ڕشانەوە ـ خورانی پێست.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

# Triamcinolone + Nystatine + Neomycin

## ترایامسینۆلۆن + نیستەیتن + نیۆمسین

**ناوی تر:**

Triamcinolon N.N

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی بەکتریایی و کەڕوو و خرۆشتنی پێست، بۆ چارەسەرکردنی خوراندن و هەستیاری پێست، بۆ پیرۆ، بۆ قڵیشانی پێست، بۆ چارەسەرکردنی خوراندنی کۆم، سووتانەوەی پێست.

**کاریگەری لاوەکی:**

هەستیاری شوێنی و ڕووشانی پێست.

شێوەی دەرمان: مەرهەم.

# Tramadol

## تڕامادۆڵ

**ناوەکانی تری:**

Tradolan, Zydol, Tiparol, Trabar, Nobligan, Gemadol

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمــانە تایبەتمەنــدی ئــازار شــکێنی هەیە، وە لە کــۆمەڵەی مــاددە بێهۆشــکەرەکانە، بەکاردێــت بــۆ ئــازارێکی کەم تــا مــام ناوەنــد وە هەروەهــا بــۆ دوای نەشتەرگەری.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرگێژبوون ـ خەواڵــوویی وشــک بــوونی دەم ـ ئــارەقە کــردن ـ بێهێــزی ـ هێڵــنج و ڕشــانەوە ـ گیــراوی ـ دڵ تێکەڵهاتن ـ هەناسە تەنگی.

**شێوەی دەرمان:** حەب ـ دەرزی.

ئاگاداربە!

تڕامــادۆڵ دەبێــتە هــۆی هــۆگری بــوون بــۆیە دەبێــت لە بەکارهێنانی بۆ ماوەیەکی درێژ بە دووربن.

# Theophylline

## سیۆفیلین

**ناوەکانی تر:**

Quibron, Theo, Minophilline

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بە کاردێت بۆ فراوان کردنی بۆڕیەکانی هەوا لە سییەکاندا، هەروەها بۆ چارەسەرکردنی رەق بوونی بۆری هەوا، هەوکردنی بۆری هەوا، هەناسە توندی، ئاوسان، شکستی دڵ، هێواش لێدانی دڵ، هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە.

**کاریگەری لاوەکی:**

نا ئارامی ـ بێخەوی ـ لەرزینی دەستەکان ـ هێڵنج و ڕشانەوە ـ خێرا لێدانی دڵ.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شروب ـ دەرزی ـ شاف.

ئاگاداربە!

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری.(C)

# Tetracycline

# تیتراسایکلین

**ناوەکانی تری:**

Tetra, Sumycin, Adcocycline, Hostacyclin

**بەکارهێنان:** بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی هەوکردنی برینی لەش، هەوکردنی زیپکە، بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی کولێرا، بەکاردێت بۆ نەخۆشی H-pylor -هەوکردنی گەدەو ریخۆڵەکان، هەوکردنی پێست، هەوکردنی کۆئەندامی میزومیزەڕۆ، هەوکردنی کۆئەندامی هەناسە، هەوکردنی چاو، هەڵ ئاوسانی چاو، هەوکردنی کۆئەندامی زاوزێ، سووتان، هەوکردن و کەڕووی ناو دەم، تای مالتا.

**کاریگەری لاوەکی:**

سەرگێژبوون ـ خەواڵوویی ـ وشک بوونی دەم ـ دڵە کوتێ ـ لەرزینی دەست ـ گیراوی.

**شێوەی دەرمان:** حەب ـ شرۆب ـ مەرهەم.

ئاگاداربە!

بۆ ئافرەتی دووگیان پۆلێندەکرێ بۆ جۆری.(D)

# Tetracaine

## تێتراکاین

**ناوەکانی ترک:**

Anestocaine, Pontocaine, Rapydan, Contralgin

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ سڕکردنی شوێنی(مەوزوعی)، سرکردن بۆ ماوەیەکی کورت، بەکاردێت بۆ پێڵوی چاو و کۆرینا، بەکاردێت بۆ سڕکردنەوەی چاو بۆ ئەو کەسانەی کە چاویان ئازاری هەیە بە هۆی لەحیم یان تیشک، بەکاردێت بۆ ئازاری چاو، بۆ ئازاری پێست، سووتان، خوراندن.

**کاریگەری لاوەکی:**

هەستیاری ـ سووتانەوە ـ سووربوونەوە ـ ڕووشانی چاو.

**شێوەی دەرمان:**

دڵۆپ ـ مەرهەم ـ لەزگە.




# Vitamine B Complex

# ڤایتەمین بی کۆمپلیکس

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە بەکاردێت لە کاتی کەم بوونی ڤیتامینB، وە بەکاردێت وەک تەواوکەری خۆراکی (مقەوی).

**کاریگەری لاوەکی:**

خوران _ سووربوونەوەی پێست _ وشکبوونی پێست.

**شێوەی دەرمان:**

حەب _ دەرزی _ شەربەت.

# Vancomycin

# ڤانكۆمایسین

**ناوەكانی تر:**
Vancocin

**بەكارهێنان:**
بەكاردێت لەكاتی هەوكردنی ڕیخۆڵەكان بەهۆی بەكتریای E-coli ، نەخۆشی سكچوون، هەوكردنی كۆئەندامی هەناسە.

**كاریگەری لاوەكی:**
تا - دڵ تێكهەڵهاتن - نادروستی گەدە - خورانی پێست.

**شێوەی دەرمان:** حەب.

## Vitagnus
## ڤیتاگنوس

**بەکارھێنان:**

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ نەھێشتنی نارێکی سووڕی مانگانە و تێکچوونەکانی تەمەنی بێ ئومێدی لە ئافرەتان.

**شێوەی دەرمان:** دڵۆپ.

## Vitamin – E
## ڤیتامین ئی

**بەکارھێنان:**

ئەم دەرمانە لە حاڵەتەکانی کەمبوونی ڤیتامین (E)و ھەندێ لە نەخۆشیەکانی پێست بەکاردێت.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ دەرزی.

# Vitamin-A
# ڤیتامین-ئەی

**بەکارهێنان :**

ئەم دەرمـــانە وەک تەواوکەری خـــۆراک لە ڕێجیمـــی دایکـانی سـکپڕ و دایکـانی شـیردەر و منـداڵی سـاوا بەکاردێت.

**شێوەی دەرمان:**

مەرهەمی چاو ـ دڵۆپ ـ حەب.

**تێبینی:**

مەرهەمـی ڤیتـامین A+D بەکاردێـت بـۆ پاراسـتنی پێست و هێورکردنەوەی سووتان.

# Vitamin-C

# ڤیتامین-سی

<u>بەکارهێنان:</u>

ئەم دەرمانە بەکاردێت بۆ چارەسەری کەمی ڤیتامین(C)، هەروەها بۆ خۆپاراستن و چارەسەری هەڵامەت و یارمەتی سارێژبوونی برین بەکاردێت.

<u>کاریگەری لاوەکی:</u>

بەکارهێنانی ئەم دەرمانە بۆ ماوەیەکی درێژ دەبێتە هۆی دروست بوونی بەردی گورچیلە.

<u>شێوەی دەرمان:</u> حەب - دەرزی.



# Warfarin

# وارفارین

**ناوەکانی تری**:

Coumadin, Jantoven, Marevan, Lawarin, Waran, Warfant

**بەکارهێنان** :

ئەم دەرمانە تایبەتمەندی دژە مەینی خوێنی هەیە، خوێن ڕوون دەکاتەوە، وەستانی دڵۆپێیک خوێن لە ناو دەماری خوێن هێنەر، لە ناو سییەکان، هەروەها بەکاردێت دوای سەکتەی مێشک، ناڕێکی لە لێدانی دڵ.

**کاریگەری لاوەکی**:

خوێن بەربوون لە ئەندامەکانی تردا - کەم خوێنی - ڕشانەوە - دڵ تێکەڵهاتن - قژ وەرین.

**شێوەی دەرمان**: حەب.

**تێبینی**: لە لایەن ئافرەتی دووگیان نابێت بەکاربێت.



# Zinc Oxide

## زینک ئۆکساید

**ناوەکانی تر:**

Zinc Caster

**بەکارهێنان:**

ئەم دەرمانە پارێزەر و پاککەرەوەی پێستە،

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی سوتانەوەی بەنهەنگڵ لە منداڵدا، فێنک کردنەوەی پێست، سووتانی پێست، نەرم کردنەوەی پێست، پارێزگاری کردنی پێست لە تیشکی خۆر، سوتانەوەی پێستی منداڵ.

**کاریگەری لاوەکی:**

ڕووشانی پێست ـ پەڵەی پێست .

**شێوەی دەرمان:**

مەرهەم.

# Zinc

# زینك

**ناوەکانی تری:**

Zinc, Zincris, Zinc oxide, Octozinc

**بەکارهێنان:**

بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی کەمی زینک لە لەشدا، بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی سکچوون لە منداڵدا، زیپکەی دەم و چاو، سوتانەوە، گەرانەوەی ووزە بو لەش، چالاک کردنی گەشەی منداڵ، چاک بونەوەی برین، هەلامەت، هەوکردنی سییەکان، هەستیاری پێست، قلیشانی پێست، ئەکزیما، پەڵەی سوور، نەرم کردنەوەی پێست.

**کاریگەری لاوەکی:**

تێکچوونی کۆئەندامی هەرس ـ ڕشانەوە ـ ئازاری سک ـ ڕەوانی ـ سەرئێشە ـ ڕووشانی گەدە.

**شێوەی دەرمان:**

حەب ـ شرۆب.

# بابەت ژمارەی لاپەڕە



بەرزکردنەوەی توانای دەروونی و زیادکردنی بڕوا بەخۆبوونی نەخۆش کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر چاکبوونەوەی.

لەبەر ئەوە دووربکەونەوە لە بەکارهێنانی دەرمان لە هەموو نەخۆشییەکی سادە یاخود بەبێ ڕێنمایی دکتۆر.

دەرمان شوێنەواری خراپ جێدەهێڵێت لەسەر بەکارهێنەرانی.



بەرگ : ئەحمەد هەرتەلی





ناوەندی ڕەها
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

هەولێر - بازاڕی ڕۆشنبیری - تەنیشت پارێزگا
0750 406 66 74
ڕەها / RAHA